لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد



# یادگاری لاوان و دیاریی لاوان

چاوگێڕانێک بە باری ڕۆشنبیریی کوردستانی عێراقدا لە ساڵەکانی «سی»دا

غەفور میرزا کەریم

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بەغدا — ١٩٧٨

له چاپكراوه‌كانی كۆڕی زانیاری كورد

# یادگاری لاوان و دیاری لاوان

چاوگێڕانێك به باری رۆشنبیری كوردستانی عیراقدا له ساڵه‌كانی ((سی))دا

غه‌فور میرزا كه‌ریم

چاپخانه‌ی كۆڕی زانیاری كورد

به‌غدا – ۱۹۷۸

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

# (( ذكريات الشباب ))

# و

# (( هدايا الشباب ))

## نظرة في مستوى الثقافة الكردية بكردستان العراق في الثلاثينات

غفور ميرزا كريم

مطبعة المجمع العلمي الكردي

بغداد ١٩٧٨

پاش بەرپاکردنی شۆڕشی بیست و شۆڕشەکانی یەك لە دوای یەکی کورد ، ئاڵ و گۆڕێکی بنەڕەتی و گۆڕانێکی قوڵی تازە بەسەر دار و پەردوی کۆمەڵگای وڵاتدا هات ، بە رەنگێك کە شوێن پەنجە و جێ دەستی دیاری‌کراوی لە هەمو روییەك و لە هەمو مەیدانێکدا بەدی دەکرا ، بگرە لە دۆخ و پلەی هاتنی ئینگلیزەوە واتە لە ساڵی ١٩١٤ تا دەگاتە دەوری بەستنی پەیمانی دیلێتی ١٩٣٠ بە جارێك سەر و سیمای کۆمەڵایەتی ، چینایەتی ، ئابوری ، زانستی کەوتە بەر چەکوشی گۆڕین و دەسکارییەوە •

دیارە چەوساوانی کورد و عەرەب لە « رومەیسە » و « رارنجیە » و « عرصات » لە دەشت و دەری خوارۆی عێراق و لە « بەردەقارەمان » و لە کەژ و کێوەکانی کوردستان لە ئامێدی و زاخۆ ، ئەو خوێنانەی رشتیان ، ئەو ئازایەتی و قارەمانیەتییەی نواندیان بە تەواوی بەری شیرینی نەدا و عێراقێکی سەربەست و ئازاد و دەسەڵاتێکی نیشتیمانی خۆماڵی پاکی بێ‌گەردی نەهێنایە دی • کورد وتەنی تۆپزی عەرەب و خەنجەری کورد لە کۆرەی خەباتدا بەرامبەر تۆپ و فڕۆکە و مەترەلۆزی ئینگلیز هەر ئەوەندەی بڕ کرد و کارکرد ، واتە : بزوتنەوەی نیشتیمانی بەو سەرکردایەتییە دەسەپاچەیە هەر ئەوەندەی لە وزەدا بو لەو قوناخە مێژوییە لەو هەل و مەرجە

ئاڵۆزەدا کە فەرمان ڕەوایێ یەکسەری بێگانە بگۆڕێ بە دەسەڵاتێکی بە ناو نیشتیمانیێ و هەنگاوێك یان پلەیەك عیراق بەرێ بۆ پێشەوە ، بەڵام لە سەرێکی ترەوە بیروباوەڕی بێ هاوتای شۆڕشگێڕانە گیانی بێ پەروای لێ بوردن و خۆبەختکردنی خستەسەر خەرمانی تێکۆشانی نەسرەوتی گەلەکەمان ، ڕۆڵە نەبەزەکانی عەرەب و کورد قارەمانیەتێ بێ وێنەیان بە ڕەنگی تۆوی ئازایەتێ و مرۆڤایەتێ و برایەتێ لەم دەشت و دەر و خاك و خۆڵەی وڵاتدا چاند کە هەتا هەتایە تێکۆشەران بە عەشقی ئەو ترووسکە پرشنگدارەوە بڕۆن و سوود لە دەریای بێ بنی بە نرخی ئەو گەنجینە پڕ گەوهەرە وەرگرن و لە کاتی تەنگانە و گێژەلوکەی شەوەزەنگی ژیاندا بیکەن بە توێشووی ڕێگا چرای بەرپێیان بۆ ڕوناككردنەوەی ڕێگای ئازادیێ و ڕزگارییان لە چنگ داگیرکەر و داموودەزگای و بۆ پێکهێنانی ژیانێکی کامەرانیێ و بەختیاریێ •

بەم چەشنە ئینگلیزە داگیرکەرەکان بۆ ماوەدان بە چەوساندنەوە و تالان و بڕۆکردنی سامانی وڵات و پێشێلکردنی و سەرکوتکردنی جوڵانەوەی نیشتیمانیێ ، چینی دەرەبەگیان بە هێز کرد و هێنایانە سەر کار و لە فەرمانڕەواییدا بەشداریان کرد و لە ژێر پەردەی ئاڵای نیشتیمانیێ و دەستوور و ئەنجومەنی نوێنەران و پیاو ماقوڵان و هەموو ساختە و داتاشراو ، گەلی عیراقی خستبوە ژێر باری دیلێتیێ و کوێرەوەریێ و برسێتیێیەوە •

بەم ڕەنگە ڕژێمی نیمچە ئیمپریالیزمی ــ نیمچە دەرەبەگیێ ، بە باڵای کۆمەڵگای عیراقدا بڕا ، لە لایەکەوە چینی فەرمانڕەوا نوێنەرانی دەرەبەگ و پیاوەکانی ئیمپریالزم ، بە کوتەك و ئاسن بەربوونە وێزەی گەل ، بە زەبری لەشکری داگیرکەر دەسەڵاتی ناڕەوایان خستبوە کار ، لە لایەکی تریشەوە هەموو گەل بە کورد و عەرەب و هەموو چینەکانیەوە بە بێ جیاوازیێ لە ژێر باری سەختی چەوساندنەوەی هەمە جۆردا مەیدانی خەباتی بێ وچانیان گرتبوە بەر ، بێ من و تۆتۆیێ پاچ و بێڵی تێکۆشانیان لەسەر دەفی شانیان

دانابو بۆ رزگاریَ و ئازادیَ خۆیان بەخت دەکرد و قوربانییان دەدا •

دیارە نابێت ئەوەمان لە بیر بچێ کە تێکۆشان و زۆران بازیَ و ململانێی نێوان گەل و ئیمپریالیزم لە سەرەتای داگیرکردنی عێراقەوە تا مۆرکردنی پەیمانی دیلێتیَ ۱۹۳۰ لە چوارچێوەیەکی تایبەتیدا دەهات و دەچوَ کە بریتیَ بو لە گێرە و کێشەیەکی سەخت و بەیەکا هاتنێکی تیژ کە لە ئەنجامدا هەردو هێز و هەردوَ بەرە لەیەك ئاشکرا بوَن و بە تەواویَ لەیەك جیابوَنەوە ، ئەوەبوَ توێژێك لە توێژەکانی کۆمەڵ روَیانی لەگەڵ وەرگێرا و چوَنە پاڵ ئیمپریالیزم و داموەدەزگا بۆگەنێوەکانیەوە و دانیان نا بە پەیمانی ناپەسەندی ۱۹۳۰ دا و بە هەنگاوێکی پێشکەوتویان لە قەڵەم دا و لەبەر دەرگای ناز و نیعمەتی داگیرکەردا هەڵتروَشکان و ملیان لە گەل و تێکۆشان وەرچەرخاند•

لە سەرەتای شۆڕشی بیست و شۆڕشەکانی کوردەوە تا دەهات دەوری قوتابی تازە پێگەیشتوَ و لاوی خوێنگەرمیَ مەلاشوَ هەڵدراو بە گیانی شۆڕشگێڕیَ گۆشکراو بە خۆشەویستیَ نیشتمانیَ و گەل لە شارەکاندا و بە تایبەتیَ لە بەغدادا بەرەو زیاد بوَن و کاریگەرتر دەچوَ • دیارە گواستنەوەی مەڵبەند و بنکەی جوَلانەوەی نیشتیمانیَ لە دێهاتەکانەوە ، بۆ ناوجەرگەی شارەکان ئەرك و فەرمانێکی پیرۆز و دەورێکی بالای هاویشتە سەر ئەستۆی قوتابیان ، کرێکاران ، رۆشنبیران کە بە چاری ناچاریَ و بێ پێویستیَ مێژوَ بوَنە بەرێوەبەر و جڵەوکێشی ئەم جوَلانەوەیە و لە مەیدانی تێکۆشانی شۆڕشگێڕیدا بە رەنگێ خۆیان رێكخستبوَ وەکو هێزێکی ترسناك لە ئاستیا تەخت و بەختی کۆنەپەرستانیان دەخستە لەرزە •

بەم رەنگە شێوەی تێکۆشانێکی نوێ هاتە کۆڕی مەیدانەوە ، سکالاتوَستن ، خۆپیشاندان ، مانگرتن ، کۆبوَنەوە ، خەباتی رۆژنامەگەریَ ، خەباتی حیزبایەتیَ « ئەم دەسکەوتە کە بە زۆر گەل لە سالی ۱۹۲۲ لە ئیمپریالیزمی بچڕیَ» بوَ باو و بوَ بە چەکی دەستی لێقەوماوان و زۆرلێکراوان

بۆ هێنانەدی مافی رەوایان و بۆ رزگاریێ و سەربەستییان • بەم شـێوەش قوتابییان و رۆشنبیران بوونە ماکی هەژاندنی گیانی شۆڕشگێڕیێ و جلەوکێشی بزوتنەوەی نیشتیمانیێ و هەوێنی بەربەرەکانیکردنی دوژمن ، دیارە زیادبوونی قوتابخانە و ماوەدان بە دەرچوونی رۆژنامەی نیشتیمـانیێ ، هـاتنی حیزبـە نیشتیمانییەکان و کۆڕ و کۆمەلی تر بۆ سەر شانۆی خەباتی ئاشـکرایێ ، سەردەرهێنانی چرۆی چینی کرێکاران و پێشکەوتنی کۆمەلگای عێراق لـە هەموو سوچ و لایەکەوە ، خواستی مێژوو پێویستیێ گەل بلاوبونەوەی بـیری نویێ تیشـکی بە تینی ئوکتۆبەری مەزن راپەڕینی گەلانی ژێردەسـت لە جیهانا ، ئەمانە بە گشتیێ لە قازانی کومەلگا یعێراقدا جۆشی خوارد ، بـار و دۆخێکی تازەی هێنایە گۆڕیێ ، قوتابیان و لاوان رۆشنبیرانی تازە کورەی خستە سەرباری بیرکردنەوە و جولە و راپەڕین تا دەوری خۆیـان بگێڕن ، ئەرکی سەر شانیان بزانن ، تا زەنگی وریابونەوە بۆ گەل لێبدەن بانـگی بەرگریێ و هەلشاخان راهێلن ، پشتێنی تیێکۆشان دژی دوژمنی خوێنەخۆی قین ئەستور ببەستن ، بۆیەکا بەرامبەر حەموو دەستدرێژییەکی ئیمپریالیـزم شالاوبردنێکی دامودەزگای چاوەڕاو و پروپاگەندەیەکی نۆکەرانی هێـزی نیشتیمانیش دەکەوتەوە جولە و بە رووی پیلانەکانیا دەتەقینـەوە و بـاشتر پەنای دەبردە بەر پتەوکردنی یەکیتیێ نیشتیمانیێ و شورەی برایەتیێ چـاکتر قایم دەکرد • باشترین نموونەش ئەو خۆپیشاندانە گەورەیە بوو کە لە هەشتی شوباتی ١٩٢٨ی قوتابیانی بەغدا دژی هاتنی ئەلفرێد مۆندی زایۆنیزم رێکیان خست کە دەوری بێشەنگی قوتابیان و جێگای گرنگی دیاریێکراویان وەکو هێزێکی نویێ و کاریگەر تیایدا دەبینرا •

بەم چەشنە شەقامەکانی بەغدا و شارەکانی تر و حەوشەی مزگەوتەکان و چایخانەکان کە بە یانەی گەل دادەنران ، لە کۆڕ بەسـتن و کۆبونـەوە و بیرگۆڕینەوە و خۆپیشاندانا جمەی دەهات و لە ژێر دروشمی « بـا بژیێ

عێراق بە سەربەستی و بە ئازادی ، بمرێ خائنان ، لە ڕێگای نیشتیماندا دەژین ، لە ڕێگای عێراقدا دەژین ، پەیمانی دیلێتیمان ناوێ ، گەل ریز دەبو دەنگ و هاواریان گوێی ئاسمانی کەڕ دەکرد و کۆلەکەی دامودەزگای ئیمپریالیزمی دەلەرزاند •

پاش بەستنی پەیمانی ناپەسەندی ۱۹۳۰ ئاگری تێکۆشان بۆ بەرگریکردن لە سەر تا خواری ولاتدا تا دەهات گڕپەی دەسەند و گیانی هەلشاخان و تەقینەوە بە ڕوی دامودەزگای میریدا وەك ئاگر و پوش بلاو دەبونەوە ، قازانی مانگرتن و خۆپیشاندان لە هەمو سوچ و قوشبنێکی ولاتدا هەر قولی دەدا و زەنگی ڕاپەڕینی دەبزواند و بازوی ئاسنین رادەوەشێنرا ، بە تایبەتی لە بەغدادا دەنگی دلێری گەل دەگەیشتە حەوت تەبەقەی ئاسمان و ترس و سامی دەخستە دلی پیاوەکانی ئیمپریالیزمەوە و هەڕەشەی لە ڕژێمی بۆگەنیان دەکرد ، کۆشك و تەلاری چەوساندنەوە و تالان و بڕۆیانی هێنابووە لەقە لەق • پەیمانی دیلێتی ۱۹۳۰ لە کوردستانیشدا ئاگری وریابونەوەی خۆش‌دەکرد و ژیلەمۆی ڕق و قینی گەشانەوە و لاوان چەکی تێکۆشانیان کرد بە شانا و پشتێنی تۆلەیان لێ بەست ، هەوری خەمی نائومێدییان ڕەوانەوە ، بە بازوی ئاسنین و گیانی باوەڕ بەخۆبون تەلیسمی نهێنی ورەبەردانی دۆش داماویان ورد و خاش‌کرد ، ئەو بەند و باوەیان دا بە دەم ڕەشەباوە کە دەیگوت،کورد دەبێت بە دەست داخ و ئۆمنی چەرخی چەپ گەردەوە بتلێتەوە ، پشت بکاتە بەهەشتی خۆشی ژیان ، ڕو بکاتە کەندەلانی کەساسی و مردن ، با هەر بگری بۆ خۆی ، با چاوەڕوانی دەرفەتێکی‌تر بکات لاوانی کورد لە سلێمانی وەکو شێری ناو بێشە بە ڕوی پەیمانی ۱۹۳۰ دا تەقینەوە و کەوتنە جۆش و خرۆش و ئالای بەرگرییان هەلکرد و هاتنە کۆڕی مەیدانەوە ، هەمو چەك و جبەخانەیان چەند وشەیەکی مەردانە بو کە دلی دوژمنی دەسمی و هەڕەشەی لە عەرشی چەوساندنەوە و زۆرداریان

دەکرد •

ئەو ڕۆژە لاوان بە باوەڕێکی بێ وێنەوە سنگیان دەکردە قەڵغانی گوللەی دوژمن ، عەولە ستیس و هاوڕێکانی ، بەوپەڕی ئازایی‌یەوە هەڵمەتیان دەبردە سەر مەترەلۆزی بەر دەرکی سەرا و کارێکی ئەوتۆیان بە دەستە و دایەرەی ئینگلیز کرد ، مەگەر هەر با بەدەواری شەڕی بکا • بەم چەشنە سەرگوزەشتەیەکی پاڵەوانییان لە مێژووی گەلدا تۆمارکرد •

خوێنی گەشی لاوان و قوتابیانی تازە پێ‌گەیشتو لەگەڵ خەڵکی ڕەش و ڕووتی سلێمانی لە باخچەکەی سەرادا تێکەڵ بە یەك بوو و بوو بە گوڵێکی سوور بە بەر یەخەی ڕۆژگاری تێ‌کۆشانەوە کە هەتا هەتایە شاعیران و ئەدیبان پیایا هەڵدەدەن و لاوان بە چواردەوریا هەڵدەپەڕن ، جێگای خۆیەتی ئەگەر بڵێین پێویستی تێ‌کۆشان و خواستی مێژوو دڵی لاوانی خوێن‌گەرمی پێش‌کەوتن خوازی چاوپشکوتوی بە دیمەنی جوانی کەژ و کێوی کوردستان هێنایە هەژان ، قوتابیانی تازە پێ‌گەیشتوی مەلاشو هەلهێنراو بە هاواری هەزاران کەسان خستنە سەر ڕێگای خەبات ، بەم چەشنە هێزێکی نوێی تازە کۆرەی ئامادەبو بۆ گشت قوربانی دانی بۆ وەرگرتنی جڵەوی سەرکردایەتی بزوتنەوەی نیشتیمانی هاتە کۆڕی خەباتەوە •

بە پێی ئەم ڕاستییە دەتوانین بڵێین کە ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠ سەرچاوەی قۆناخێکی نوێیە لە تێ‌کۆشانی گەلدا و سەرەتاکردنەوەیەکی تازە لەسەر گوزەشتەی دور و درێژی خەباتیدا تۆمار دەکا • لەم ڕۆژەدا قوتابییان دەوری مێژوویی خۆیان وەرگرت و ئەرکێکی نیشتیمانی‌یان خستە ئەستۆ و بوو بە گوڵەباخی بەیەخە کراوی ڕەش و ڕووتی گەلەوە وەکو هێزێکی کارای چاونەترس باری پێشکەوتنی وڵاتی گرتە دەست و بوونە سەرچۆپی کێشی بزوتنەوەی نیشتیمانی و دڵسۆزانە بە کوڵ گوێیان لە گریان و پەژارە و تاڵی و سوێری هەژاران و لێ‌قەوماوان دەگرت ، بەتەنگ هاواری

داخوازیَ کەساس و رەش و رووتی ولاتەوە بوون ، بە ئازایەتیَ و قارەمانانـە بەشداریَ هەموو راپەڕین و هەڵشاخانی یەك لە دوای یەکی ئــەم گەلەیـان دەکرد تا بە هێزی پاڵەوانانەی هەموو لایەك تاریکیَ رێگای ژیانیان بە خوێنی گەش رووناك کردەوە ، زنجیری دیلێتییان پچڕاند ، پەیمانەکانی ئیستیعمار و نۆکەرەکانیان خستـــە ســەر سەرەنوێلکەی مێژوو ، تــەختی زۆرداریَ و چەوساندنەوەیان لە هەردوو شۆڕشی ١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨ و ١٧ ی تەمووزی ١٩٦٨ هەڵتەکاند و گەل بە ئازادیَ و شادیَ دەستی لە ملی هیواکرد و بانگی برایەتیَ کورد و عەرەبی راهێشت ، بەری رەنجی چەند ساڵەی تیَکۆشانی هـاتە دیَ •

شەشی رەشی ئەیلول هەرچەندە ئامانجی نەپێکا و گرەوی سەرکەوتنی نەبردەوە و هیوا و خۆزگەی پڕ سۆزی کوردی نەهێنایەدیَ ، ئاسۆی شینی بەختیاریَ دوارۆژی بە تەپ و دووکەڵی نائومێدیَ و خەم داگرت ، کلاورۆژنەی رووناکی ئاواتی بەرزی گەلی بە هەوری رەشی مەینەت تەنیَ ، بەلام بە کوێرایی چاوی دوژمن بیر و باوەڕێکی زیندووی لە دڵ و گیانی میللــەتدا رواند ، خوێنی لاوانی ئالا هەڵگر و خۆبەختکەر ، بۆ هەوێنی پیَگەیاندن و مەشق پیَکردنی نەوەی دوارۆژ لە پێناوی زیاتر قوربانیَ دان و ئازایەتیَ نواندن و مل لە تیغ سواندن لە رێگای گەل و نیشتیمانندا • بەراســتیَ قارەمــانێتیَ قوتابیان و لاوان کارێکی ئەوتۆی گێڕا ، ئاوێکی وای رشت کە ئاگری تۆڵە سەندن بەر بداتە دڵی پەســتی پڕ لە پەژارەی شــێخ مەحموودی نــەمر لە «پیران» و لە خەوی دەس‌بەسەریَ و نائومێدیَ رایچەڵەکێنیَ و کەژ و کێو سەرلەنویَ بگرێتــەوە بەر ، بۆ ئەوەی تۆڵەی خــوێنی جگەرگۆشــەکانی بسێنێتەوە • جارێکی تر بزووتنەوەی چەکدارانــەی بەرپــاکردەوە و بــە یاداشتێك مافە رەواکانی گەلی کوردی خستەوە یادی کاربەدەستانی بەغدا •

هەرچەندە لە ئەنجامدا و پاش داخ رشــتنی دڵی بە هێزی دوژمن لــە

شەڕی « ئاوبارێك » دا کەوتەوە بەندی دیلێتی و لە بەغدا دەس‌بەسەرکرا •

ڕوداوەکەی شەشی ڕەشی ئەیلول پاڵەوانایەتی لاوانی کونلـەجەرگ نەبو و بە ڕەنگێ گێنگڵی لە مێشك و دڵی گەلدا دەخوارد و بو بە هۆیــەکی سەرەکی دامەزراندنی کۆمەڵەی لاوان ، تا لە ساڵی ۱۹۳۳ دا ئەم دەستە لاوە خوێن گەرمە بینە میراتگر و تەواوکەری ئەو ڕێبازە پیرۆزە •

لە سەرەتای ساڵەکانی ۳۰ دا کۆمەڵە لاوێــکی خــوێن‌گەرمی ســەر بە خولیای ، دڵوریای تازە پێ‌گەیشتو ، بە مەبەســتی خوێندنی بەرز لــە شارەکانی کوردستانەوە لە بەغدا هەوارگەی خۆیان خست ، بە ژمارە ٦٠ ــ ٧٠ کەس دەبون • چونکە لەو ڕۆژەدا خەڵــکی زۆر هەڵپــەیان بۆ چونــە قوتابخانە و وەرگرتنی خوێندن و زانســتی نەدەکرد • بێجگە لــەوەی کە هێشتا باری ســیاسی و کۆمەڵایــەتی و ئــابوری لە عێراقــدا نەچــوبوە چوارچێوەیەکی توند و تــۆڵ •

لە هەمو لایەکی وڵاتــدا ئاگری بەربــەرەکانێ و هــەڵچونی گەرم ، تەقینەوەی گڕاوی دژی ئیمپریالیزم و کاربەدەستانی کلپەی دەسەند و زیاتر بەرز دەبوەوە • ئەم دەستە لاوە سەرچڵە هەرچەندە کەم بون بەڵام بــاری ناکۆك و نالەباری گەل مێشـکی بە جارێ داگیرکردبون • ئاوات و ئامانجی پــیرۆزی گەل پلی لــە دڵ و دەرونیــاندا دەدا ، کاول‌کردنی نیشتیمــان و هەژاری و کەساسی ئاگری لە جــەرگ بەردابون ، خــوێنی شەهیــدانی بەردەقارەمان و بەردەرگای سەرا و ئاوبارێك و کەژ و کێوەکانی کوردستان هێز و هەناوی لێ‌بڕیبون ، هەر ساتە نەساتێك ڕای دەهەژاندن و برینی تازە دەکردنــەوە •

جێگەی خۆیەتی ئەگەر بڵێین قەد ناتوانین جیهانی ئەم دەستەلاوانە و چۆنێتی ژیانیان پەژارەی دڵیان ، ئاوات و خۆزگەیان لە یەك جیا بکەینەوە و

لەو بار و دۆخە ناهەموارە و کورەی ئـەو چەرخ و دەورە • کورد وتەنێ «مشتێ نموونەی خەرواریکە !» •

ئەم لاوانە کە هەر یەکەیان رۆڵەی شارێك و بنەماڵەیەکی جیاجیا بون ، مێز و کورسێ خوێندن لە بەغدا رێکی خستبون و کۆی کردبونەوە• بێ گومان ئەم لاوانە وێنە و روخساری کۆمەڵگای ئەو رۆژەبون • واتە بە لێو بەبارێ و چاو بە فرمێسك و بە قوڵپی گریانەوە بۆ خوێندن هاتبونە بەغدا و بونـە دراوسێ و هاوخەمی شێری دلێری دەسـتە بەستەی ( شێخی نەمر ) لـە گەڕەکی ئەعزەمییە •

لە کاتێکدا دروشمی برایەتێ و یەکێتێ دژی بە تاریکێ شـەوەزەنگی ناکۆکێ و نشوستێیەوە دەنا ، رێبازی تێکۆشانی هاوبەشێ و برایەتێ لـە نێوان کورد و عەرەبدا تا دەهات چرۆی دەردەکرد و سەری دەردەهێنـا و بنجی دادەکوتا و جێگای سروشـتێ خـۆی دەگرت • هەروەهـا چینـە جیاوازەکانی ئەو کۆمەڵە برژاوەی بە ئاگری زۆرداریێ ئیمپریالیزم و بە پێی پێویستێ خواستی مێژو لە یەکتر نزیك دەبونەوە • تێکۆشەران لە هەمـو لایەك سەریان دەنا بە یەکەوە ، دڵ و دەرونی یەکتریان دەخوێندەوە ، دەرد و زوخاویان بۆ یەك هەڵدەڕشت•شورای برایەتێ و دۆستایەتییان دادەمەزراند و دادەڕشت• دیارە باری گرانی چەوساندنەوەی بێ وێنەی زەبر و زەنگی دام و دەزگای ئیمپریالیزم و دوژمنی سەرەکێ بێ ئابڕوی گەل بو بە هەوێن بـۆ داڕشتنی بەرەی گەل و رێكخستنی هەوڵ و تەقەلایان تا دەست بدەنە چەکی تازەی تێکۆشان بە پێی ئەو هەوڵ و مەرجە •

بۆیەکا بەغدا و شارەکانی تر لە عێراقدا بونە لانەی هێزی بەربەرەکانێ و راپەڕین و چاوکردنەوە و چست و چالاکێ گەرم ، هەروەهـا قوتابیـان و رۆشنبیرانیش بونە چقلی تیژی چاوی ئیمپریالیزم و جێگایـان بە دەسـتەی

نۆکەران و کۆنەپەرستان تەنگ و لێژ دەکرد و ژیانیان پێ تاڵدەکردن و بۆنە هێزێکی ترسێنەر دژی هەمو نەخشە و پیلانەکانیان • هەروەهـا بە نـاوی جەژنە ئایینێکان و یادکردنەوەی شەهید کردنی حەزرەتی حەسەن و حوسێن• رەگ و ریشـەی دوبەرەکی نێوان سوننی وشـیعەی هەڵدەکێشا و تۆوی برایەتی و دۆستایەتی دەچاند و یەکێتی گەل بناغەی ئەستوری دادەکوتا •• هێزی نوێ پەیتا پەیتا لێوەشاوەیی و زرنگی و ئازایەتی لە ناو ریزی گەلدا دەچەسپاند • خەڵکیش باشتر و گەرم و گوڕتر گوێیان بۆ دروشـمەکانی شلدەکرد و شانبەشـانی دەڕۆیشت و زیـاتر ئاگری بەربـەرەکانێ دژی ئیمپریالیزم و داموودەزگاکانی خۆش دەکرد • بە تایبەتی سەردەرهێنانی چرۆی چینی کرێکاران و مانگرتنە بە ناوبانگەکەی یەکی تەموزی ١٩٣١ کارێـکی بە هێزی کردە سەر کۆمەڵ و بە جـارێ قەڵەمی ئـەژنۆی دەسـت و پێی دەشکاند و بۆ بە ماکی هەڵچون و شەپۆلدان بۆ گەشەکردن و پەرەپێدانی جولانەوەی نیشتیمانی • ئەمـە لە لایەك و لە لایەکی تریشـەوە دەسـتەی ئەهالی [١] کە لە دوی کانونی دووەمدا هاتە کۆڕی مەیدانەوە لاپەڕەیـەکی نوێیان کردەوە لە مێژوی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی عێراق و تاشە بەردێکی تلنەدراوەیان خستە سەر بناغەی بزوتنەوەی نیشتیمانی •

بەڕاستی دەرچونی رۆژنامەی (الاهالي) لە دوی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٣٢ دا سەرەتایەکی شۆڕشگێڕانەی لە مێژوی گەلدا تۆمارکرد و بو بـە هەوێن بۆ هەژاندنی مێشك و دڵی لاوان و قوتابیان و گۆشکردنیـان بـە بیری نوێ و چاوهەڵهێنانیـان بە رێگە و شـوێنی تـازەی تێکۆشـان و

---

(١) وەزارەتی ناوخۆ لـە (٢)ی تـەموزی سـاڵی ١٩٣١دا رێـگەیدا کـە رۆژنامەیەکی رۆژانەی سیاسی بە ناوی ( اهالی )یەوە دەرچێ و یەکەم ژمارەی لە (٢)ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٣٢دا لەچاپ درا و کە لە سەری نوسرابو « دەستەیەك لـە لاوان دەری دەکەن » . عن کتاب التطورات السیاسیه في العراق ١٩٤١ ــ ١٩٥٢ ، جعفر عباس حمیدی .

بەرزکردنەوەی دروشمی راست و رەوا لە ناو گەلدا • هەروەها بۆ یەکەم جار نەك لە عێراقدا بەڵکو دەتوانین بڵێین لە هەمۆ رۆژهەڵاتی ناوڕاستدا دروشمی خۆماڵیکردنی کۆمپانیای کارەبای بەغدا بەرز بوەوە ، بە هۆی هەوڵ و کۆششی دەستەی (الاهالي)یەوە • دیارە بێ مەلامەت نیە لە چلەکاندا ئەم لاوانەی ئەهالیێ بۆنە سەرۆکی سێ پارتی نیشتیمانیێ وەك ( الحزب الوطني الديمقراطي ، حزب الشعب ، حزب الاتحاد الوطنى ) • لە بزوتنەوەی شۆڕشگێڕیش لە عێراقدا کەسێك نیە ناوی «جعفر ابو تمن» و « كامل چادرچى » و «عبدالفتاح ابراهيم» و «عزيز شريف» و «حسين جميل» و «عبدالقادر اسماعيل» و «محمد حديد»ی ••• هتد •• نەبیستبێت و بە چاوی رێزەوە نەڕوانێتە هەوڵ و خەباتی بێ وچانیان •

رۆداو و گێر و گرفتی جهانیێ لە ساڵەکانی ١٩٢٩ ـ ١٩٣٣ لە لایەکەوە و هاتنی فاشییەت بۆ سەر تەختی دەسەڵاتداریێتیێ لە ئەوروپا ـ ئەڵمانیا ـ ئیتالیا لە رۆژهەڵاتی دوور ژاپۆن لە لایەکی ترەوە جێگیربونی رژێمی سۆشیالیستیێ و پێشکەوتنی بازاڕی ئابوریێ سۆشیالیست لە یەکێتیێ سۆڤیەتدا و گەشەکردنی بیر و باوەڕی نوێ ، هەردۆ رۆداوەکە بار و بارخانەی خۆی دانا و وێنە و نەخشە و جێ دەستی خۆی لە هەمۆ مەیدانەکانی عێراقدا دەبینرا و دیاریێ دەکرا ، بۆیە لەپاڵ بیری نوێی تازە پشکوتودا بیری فاشیزمیش لە جێگا خۆشکردندا بۆ خۆی • واتە عێراق بە گشتیێ و بەغدا بە تایبەتیێ لەو رۆژانەدا جمەی دەهات و لە چست و چالاکیێ و بەربەرەکانیکردنی دام و دەزگاکانی ئیمپریالیزم و پیاوەکانی • لە ئاستی هوروژم و شەپۆلی هەڵچۆنی گەلدا پیلانی نۆکەرانیش هەڵدەوەشایەوە و دەستە و چینی فەرمانڕەواش بە چۆکا دەهاتن و جێگایان بۆ جوڵانەوەی نیشتیمانیێ چۆڵ دەکرد • لە لایەکی تریشەوە بەرەی تێکۆشەرانی گەل گورزی خۆی دەوەشاند و هەوڵ و تەقەلای دەدا کە بیری نوێ و رێگەی

تێکۆشانی شۆڕشگێڕانه بکا به بالای جوڵانەوەی نیشتیمانیی ، تا له دوایيدا سەرکردەیەکی لێوەشاوەی نەترسی راستی وا پــەروەردە بکات که بتوانێ گەل بگەیەنێ به ئاوات و ئامانجی بەرزی •

به کورتی بەغدا لەو رۆژانەدا قەڵای بەرزی تێکۆشانی بنکەی وریــا بونەوە و راپەڕین بو • کۆلیجەکانی پزیشکی و «دار المعلمین» و جێگەکانی تری خوێندەواری بوبوە لانــەی وریا بونــەوەی گیانی شۆڕشـــگێڕانە • یەکێتی و برایەتی و دەوری قوتابیان تا دەهات زیاتر و کاریـــگەر تر دەبو • دەستەی ئەهالی و رۆژنامەکەیان بار و دۆخی لەبار ، ئەمانە هەموی هەوێنی هەڵچون و گیانی وریابونەوە بون • لاوان و قوتابیانی کوردیش نــاکرێ و ناتوانین به هیچ جۆرێك لەم بار و دۆخەیان جیا بکەینـــەوە ، بـــەڵکو بـــە پێچەوانەشەوە لاوانی کورد بەوپەڕی ئارەزو و بەختیارییەوە خۆیان فڕێدایە جەرگەی ئاگری شۆرش و خەباتەوە ، له پێنـــاوی وەرگرتنی بـــیری نوێی تێکۆشان بۆ گەل و نیشتیمان ملیان له تیغ دەسو ، گوایه ئەگەر لێقەوماوی گەل و دواکەوتنی نیشتیمان نەبێتە هـــۆی بزوتنـــەوە جوڵاندنی دەمـــاری کوردایەتییان و هەژاندنی گیانی نەتەوایەتی ئەبێ چی تر هەبێت بیانخاتە سەر سەودای تێکۆشان ؟! بۆیەکا قوتابیـــانی کورد له بەغـــدا بۆ رۆژێـــکی وا دەگەڕان و بێ سێ و دو لێکردن هاتنە ناو کۆڕی ئاگری سوری تێکۆشان و بیرکردنەوە و راپەڕین •

جا لەبەر ئەوەی که هێشتا باری جوڵانەوەی نیشتیمانیی له عێراقـــدا نەکەوتبوە چوارچێوە و هەل و مەرجێکی ئـــەوتۆوە که سەرکردایەتییـــەکی لێهاتوی یەك گرتو و چاونەترس بێتە کایەوە ، بۆیەکا ئەم بزوتنەوەیە هـــەر بە دەستە پاچەیی و ناتەواوی و کەم و کورتیەوە دەینالاند و هەر بەرەو لای شوێنەواری کۆنی بابوردودا گڕی دەخوارد ، بۆ وێنه شۆڕشی بیست لەگەڵ راپەڕینەکانی یەك له دوای یەکی کوردا هیچ پردێك یـــان پەیوەندییـــەکی

یەكگرتوی نەبو •• هەر لایە لە مەڵبەند و جێگەی خـۆیەوە بەپێی هەل و مەرجی تایبەتی خۆی پاچ و بێڵی تێكۆشانی خۆی رادەوەشاند و داوای مافی رەوای خۆی دەكرد • تەنانەت راپەڕینەكانی كوردیش لە عێراقدا چ لە بادینان یان سۆران سەركردایەتییەكی یەك گرتوی كۆ نەكردبۆوە و تەنها پەیوەندیَ گیانییان هەبو ، هەر ناوچەیەك بە پێی هەل و مەرجی تایبەتیَ خۆی دەچـو بـەڕێوە • ئەمە بۆ حاڵی شڕێ جوڵانـەوەی نیشتیمـانیَ بۆیـە حیزبـە نیشتیمانییەكانی عێراق كە بە ئاشكرا لە ژێر باڵەپەستۆی هێزی گەلدا لـە ساڵی١٩٢٢ كەوتە مەیدانی جمو جوڵ و هاتنە سەر شانۆی تێكۆشان و پەل و پۆی هەمو عێراقی نەگرتبۆوە ، داخوازییەكانی كرچ و كاڵ بون • ناتوانین بڵێین حیزبی هەمو عێراق بون ، حیزبی كورد و عەرەب ، یـا ئاڵاهەڵگری داخوازییەكانی كورد و عەرەب و هـەمو چینەكانی ئەوسـای عێراق بێ ، تەنانەت دەستەی ئەهالیش كە زۆر جیاواز بو لە هەمو روەكەوە لەو حیزبانە هێشتا نەچوبوە قەوارەی چوارچێوەی عیراق و نەبوبو بە نوێنەری هەردو نەتەوەی هەمو چینەكانی كۆمەڵ •• ئـەمە بو بار و دۆخی ئەوسـا ، بۆیە جوڵانەوەی كوردیش وێنە و روخسـارێكی تری وەرگرتبو و لـە هەل و مەرجی تایبەتیَ خۆیدا تێدەكۆشا •

لەم چەرخ و دەورەدا بزوتنەوەی كورد بە دەوری پچڕپچڕیەوە گیری خواردبو و دابەش بوبو بە چەند جۆگەیەكی جیاجیاوە ، هەر لایـە بە پێی پێویست و مەڵبەندی تایبەتیَ خۆیەوە كەوتبوە جم و جوڵ وچست و چالاكیَ داواكردن و هاواركردن • هەر دەستەیەك لە ناو جەرگەی هەل و مەرجی خۆیەوە سـەری دەرهێنابو • هەر لایە لـە تولەرێگا و رێچكەی خۆیەوە ئاگری هەوڵ و كۆششی بەرپا دەكرد و بە پێی توانا و هێزی تایبەتیَ خۆی كەوتبوە مەیدانی تێكۆشانەوە بێ ئەوەی هیچ چەشنە پەیوەندییەكی رێك و پێك و پەردێكی دروستكراو هەبێت لە نێواندا • ئامانجی هەمو لایەكیان

وریاکردنەوەی گەل، پەرەپێدانی زانستێ •• قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواریێ، دژدان بە شەوەزەنگی دواکەوتن •• هەنگاونان بۆ پێشکەوتنی نیشتیمان و دان نان بە مافی پێشێل کراوی کوردا •

شایانی باسە کە بزوتنەوەی کورد هێشتا لەم دەورەدا بە شنە بای شەماڵ بەندەکانی پەیمانی سیڤەر، چوار بەندەکەی ویلسن، قسە پفهەڵدراو و بەڵێنە گەورەکانی ئینگلیز و فەرەنسا، بڕیارەکانی کۆمەڵانی گەل « عصبة الامم » دڵی خۆی پێ فێنك دەکردەوە • لەو باوەڕەدا بوون کە چارەنوسی کورد بەندە بە ڕەوڕەوەی شەڕی رزیوی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکانەوە • بەو خەیاڵەوە مەست بوبون کە گوایە هەر ئینگلیز لە عێراقدا دەتوانێت دەست بداتە بن باڵی شکاوی کورد و لە تەنگانە و لێقەوماوێ رزگاری بکات • بەم چەشنە پشت بەستن بە بەڵێنی زل و گەورەی دوای پەیمانی قەڵەو و درۆ کەوتن ڕێگا و چەکی هیوا و هێز و هەناویان بوو •

ئەم بەیت و بالۆرە کۆنە • ئەم بیر و باوەڕە چەوتە تا ئێستاش شوێنەوارەکەی لەریزی گەلدا تۆز دەکا • تەپ و دوکەڵی ڕەشی هێشتا لە مێشك و دڵی خوێندەوارانداا نەسڕاوەتەوە و تا ئەمڕۆش هەن • ئۆباڵی هەرە گەورەی ژێر کەوتنی جوڵانەوەی کورد نەهاوێتە سەر سەرکردایەتییەکەی • گوایە دەڵێن ئەگەر ئەم سەرکردایەتییە باش چارەنوسی کوردی ببەستایە بە ئینگلیزەوە حاڵی بەم حاڵە نەدەگەیشت • وابزانم ژێرکەوتن و سەرکەوتنی هیچ جوڵانەوەیەك بەم کرچ و کاڵییە لێك نادرێتەوە، چونکە هەموو سەرکەوتنێك و ژێرکەوتنێك هەل و مەرجی خۆی هەیە و بە پێی یاسا و عیلمێکی تایبەتێ بەڕێوە دەڕوا •

شایانی باسە لە کاتی دروستبونی دەسەڵاتی بە ناو نیشتیمانێ تایبەتێ پاش پێشێڵ کردنی جوڵانەوەی کورەی ئیمپریالیزم و دام و دەزگای،

لە دابەش کردنی وەزارەت و ئەنجومەنی نوێنەران و پیاو ماقوڵاندا بەشێکی دیاریکراوی تایبەتی تەرخان دەکرا بۆ کوردەکان • بەم رەنگە هەندێ لەم وەزیر و نوێنەرانە جار و بار دەبونە مەڵبەندی دەربڕینی ناڕەزایی خەڵك و دەنگدانەوەی هاوار و بێزاری و داخوازی گەل • بە کورتی لە ژێر باڵەپەستۆی هێزی گەلدا ، لە ریزی ئەم دەستەیەدا هەندێك جار گیانی هاودەنگی لەگەڵ میللەتدا ، داواکردنی داخوازی رەوا بەرزدەبوەوە • ئەمانە دەکەوتنە جم و جوڵ کردن و چست و چالاکی نواندن بۆ مافی رەوای گەل و پێشکەوتنی نیشتیمان • بۆ نمونە لە یەکی حوزەیرانی ١٩٢٨ دا نۆ وێنەری کورد لە سلێمانی و هەولێر و کەرکوك کە پێك دەهاتن لەم بەرێزانە : « معروف جیاووك ، ئیسماعیل رەواندزی ، عبداللە مفتی ، جمال بابان لە هەولێر ، محمد صالح صبری ، سیف‌اللە لە سلێمانی ، محمد جاف ، محمد سعید لە کەرکوك » یادداشتێکیان پێشکەشی وەزارەتی مەعاریف کرد ، تیادا بار و دۆخی ناوچەکەیان لە روی زانستییەوە شی کردبۆوە ، داوای زیادکردنی قوتابخانە و قەلاچۆکردنی نەخوێندەوارییان کردبو • داخوازییە هەرە گەورەکەیان دانانی « دار المعلمین » بو لە ناوچەکەدا ، تا مامۆستای کورد زۆر بێ و خوێندەواریش پەل و پۆ بهاوێ و شوێنەواری دواکەوتن کوێر ببێتەوە •

هەروەها داوای گۆڕینی کتێبیان دەکرد بۆ کوردی ، تا هەمو کەس بخوێنێت و وڵات هەنگاو بەرەو پێشەوە بنێت • بەڕاستی ئەم یادداشتە دەنگێکی گەورەی لە ناو خەڵکدا دایەوە • کە بو بە مایەی شانازی و پێخۆشحاڵی گەل، تەنانەت رۆژنامەی ژیان لە سلێمانی بە کوردی دەقی یادداشتەکەی بڵاوکردەوە [٢] •

هەروەها کۆمەڵی زانستی کوردی لە بەهاری ١٩٢٦دا هاتە سەرشانۆی

---

(٢) ژیان لە سولەیمانی .

جم و جوڵ و خزمەتکردن لە سلێمانیٚ لە ساڵەکانی ٣٠دا دەورێکی یەکجار باڵای گێڕا لە بوژاندنەوەی گیانی کوردایەتیٚ و زیندوکردنەوەی کەلەپوری میللیٚ و هەوڵ و کۆشش کردن بۆ پەرەپێدانی زانستیٚ و بڵاوکردنەوەی خوێندەواریٚ • بەتایبەتیٚ پێویستە ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە بەڕێوەبەری ئەم کۆمەڵە ( پیرەمێرد )ی نەمر و شۆڕە سوارەکانی رۆشنبیری هاوڕێی بون ، کە ئاگرێکی گەورەیان بەرپاکرد بۆ وریابونەوە و راپەڕینی خەڵکیٚ • هەر وەکو نابێت ئەوەش لە یاد بکەین کە رۆژنامەی « ژیان » و « ژین » شانبەشانی ئەم کۆمەڵە ئاگری کوردایەتیٚ و وریابونەوەی خۆش دەکرد و کارێکی گەورەی دەگێڕا بۆ گەشەکردن و بە هێزکردنی دام و دەزگای ئەم کۆمەڵە • وا بزانم هەوڵ و تەقەلای بیٚ وچانی خۆبەختکردنی پیرەمێرد و هاوڕێیانی دڵسۆزی لە رێگای پێشکەوتنی کاولییەکەی نیشتیمان و داماویٚ گەل هەرگیز لە بیر ناچێتەوە و بە زەڕکفتی ئاڵتون لە لاپەڕەکانی مێژوی کوردا تۆمار دەکریٚ • سەرەڕای ئەوەش رۆشنبیرانی کورد توانییان بە پێز لەو رۆژە ئاڵۆزەدا مەڵبەندێکی تری رۆشنبیریٚ پێك بهێنن و بە هەوڵ و کۆشش دەرگای کۆمەڵی یانەی سەرکەوتنی کوردییان لە بەغدا کردەوە ، ئەوەش بە سەرۆکایەتیٚ ( معروف جیاووك ) تا لەم سوچ و گوزەرەوە بتوانن رەوڕەوەی پێشکەوتنی کورد بۆ پێشەوە بەرن • یانەی سەرکەوتن هەر چەند لە رواڵەتدا یانەیەکی کۆمەڵایەتیٚ روت بو بەڵام لە ناوەڕۆك و راستیدا نمونەی کۆمەڵێکی سیاسیٚ بو ، ئەرکی گەورەی نیشتیمان و پێشکەوتن و سەرکەوتنی گەلی کوردی خستبوە سەر شان • کردنەوەی کۆمەڵەکە لە رێکەوتی رۆژی هەینی ٣٠/٥/١٩٣٠ دەکات کە خۆپیشاندانێکی گەورەی کوردایەتیٚ بو ، کە بە چست و چالاکییەکی بیٚ وێنە رۆشنبیرانی کورد و ئەفسەرە کوردەکانی وەك ( جمیل صدقی زەهاویٚ ) و پیاوە گەورەکانی بەغدا هەمویان بەوپەڕی بەختیارییەوە بەشدارییان تیاداکرد •

له لایەن معروف جیاووکەوە وتارێك خوێندرایەوە کە تیادا مەبەستی دانانی ئـــەم کۆمەڵەی دەرخســـت کە بریتیی بوو لـــە خزمەت کردنی زمانی کوردیی و بڵاوکردنەوەی عیلم و زانستیی لە کوردستاندا • پاشان لە لایەن ئەدیبی نیشـــتیمان پەروەر ( خلف شـــوقی افندی داودی )یـــەوە وتارێك خوێندرایەوە • لە پاشان ئەم بەڕێزانەی خوارەوە هەڵبژێران و بوونە دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵەکە :

| ناوەکان | ژمارەی دەنگەکان | |
|---|---|---|
| ١ـ ابراهیم افندی حیدری | ٥٢ | دەنگ |
| ٢ـ امین زەکی بەگ | ١٠٧ | دەنگ |
| ٣ـ معروف افندی جیاووك | ١٦٠ | دەنگ |
| ٤ـ محمود جودت بەگ | ١٠٢ | دەنگ |
| ٥ـ عبدالله لطفي | ٨٧ | دەنگ |
| ٦ـ خلف شوقي افندی | ٩٤ | دەنگ |
| ٧ـ محمد عارف افندی ، زابتی توپچیی | ٨٦ | دەنگ |
| ٨ـ احمد آغای کرکوکلیی | ٦٣ | دەنگ |
| ٩ـ محامی عارف افندی پشدەریی | ٥٨ | دەنگ |

هەروەها ڕۆژنامەی ژیان دەربارەی ئەم کۆمەڵە لە سلێمانیی لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٣٠دا نووسیبووی :

« پشت بە خوا ئەم کۆمەڵە بە هەموو لایەکی کوردستاندا لق و پۆپ دەهاوێ و میللەتی کورد بە هەموو هێزیەوە پشتیوانییان دەکات و بۆ ئەم غایە بـــەرزە هەموو لایەك تیدەکۆشـــین و بەم ســـەبەبەوە لە تاریکیی جەهل ڕزگاریمان دەبێت و نەتەوەکەمان بە چرای معارف ڕووناك دەکرێتەوە » •

ئەم کۆمەڵەش دووبارە مەڵبەندێکی تری ڕۆشنبیریی و هێلانە و هێز و توانای ئەو ڕۆژە بوو • ئەم دەستەیەش لە سوچی تایبەتیی خۆیانەوە بازووی تێکۆشانیان ڕاوەشان و لە پێناوی زانستیی و علم و پێشـــکەوتنی وڵاتدا خۆیان تەرخان کردبوو • لە هەڵبژاردنی ئەو پیاوە ناودارانەی ئـــەم ڕۆژە و

دامەزراندنی کۆمەڵەکە بۆمان دەردەکەوێت کە رۆشنبیرانی ئەو چەرخە بەچی گوڕ و گوژمێکەوە هاتبوونە کۆڕی مەیدانەوە و چەند هیوای گەورە و ئومێدی بەرزیان لەسەر ئەم کۆمەڵە دانابوو، دیارە کۆمەڵەی یانەی سەرکەوتن توند و تۆڵ پشتوێنی تێکۆشانیان بەستبوو و ئامادەیی خۆیان پیشان دەدا کە بتوانن لە بواری گەورە گەورە بدەن و بە هەورازی بەرز بەرزا سەربکەوون ، تا بگەنە لوتکەی بەرزی شادی و ئاسۆی بەختیاری کورد •

هەروەها چاپخانەکەی ( حسێن حوزنی مۆکریانی ) لە رەواندز و دەرکردنی گۆڤاری ( زاری کرمانجی ) لە ساڵەکانی ١٩٢٦ ــ ١٩٣٢ دا و نامیلکەی جۆر بە جۆری وەك « مێژوی ناودارانی کورد » مێژوی حوکمدارانی کورد لە سێیەکاندا دووبارە بە چاوگەیەکی تری رۆشنبیری لە قەڵەم دەدرێ و بە لانەی هێز و توانا و روناکی دەژمێردرێ بۆ کورد لەو رۆژەدا • بەڕاستی مۆکریانی چاپخانەکەی کردبوو بەکورەی ئاگری راپەڕین و وریایی و چاوکردنەوەی گەل ، بە تاقی تەنیا پشت بە رۆشنبیران •• بە هەر چوار لادا ئاڵای بیرکردنەوە و سەربەستی بەرزکردبۆوە بە وێنەی دوازدە سوارەی مەریوان کەوتبوە دڕدان بە شەوەزەنگی تاریکی و نەخوێندەواری و هەنگاوی گەورەی بۆ پێشکەوتنی وڵات دەنا •

بەڕاستی سەر گوزەشتەی تێکۆشانی مۆکریانی لە پێناوی بوژاندنەوەی کەلەپوری میللی و زیندوکردنەوەی لاپەڕە ونبوەکانی مێژوی کورد جێگای شانازی و مایەی بەرزییە بۆ گەلی کورد •

هەروەها دەستەی « کوردی و مەریوانی »ش لە ساڵەکانی سیدا وەکو شێری ناوبێشە هاتنە مەیدانی خەباتی رۆشنبیری‌یەوە • چاپخانەکەشیان پشت بەخۆ و بە یارمەتی بێ وێنەی رۆشنبیران توانییان پاڵ بە رەوڕەوەی نەوەستاوی پێشکەوتنەوە بنێن •

گۆمی بەستەڵەکی رۆشنبیریێ بشڵەقێنن و لە پێناوی زیندوکردنەوەی ناوی شاعیرە گەورەکانی کورد و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان بۆ بوژاندنەوەی کەلەپوری میللیێ و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی کۆمەڵایەتیێ • زەنگی وریابونەوە و راپەڕینیان لێدەدا و گیانی خۆڕاگرتن و پشت بە خۆ بەستنیان بە بالای ئۆردوگای رۆشنبیریێ کوردا دەکرد • بە کورتیێ ئەم دەستەیەش جۆگەیەکی تر بون لە روباری تیژی نەوەستاوی گەل و چاوگەیەك بون لە چاوگەکانی وریابونەوە و راپەڕین و توانییان لە نێوان ١٩٣١ تا ١٩٣٩ دوازدە نامیلکە لە چاپ بدەن و بیخەنە ژێر دەستی خوێندەواران و ئەدەب دۆستانی کوردەوە • ئەم دەستەیەش لە مێژوی سەرگوشتەی زانیاریێ و پێشکەوتنی کورددا بەردیکی گەورەیان خستۆتە سەر کۆشك و تەلاری رۆشنبیریێ کوردەوە • لە ریزی ئەم کاروانە پێشکەوتوەدا شۆڕە سواری جڵەوکێشی مەیدان ، گورزێکی گەورەی نابوە سەر دەفەی شانێوە و لە دەشتێکی چۆلی نائومێدیدا بەردی بناغەی بەرزی مێژوی کوردیێ تۆمار دەکەن • هەروەکو چۆن ناکرێ لە ناو کەژ و کێوەکانی کوردستاندا باسی « پیرە مەگرون » نەکرێ ئاوهاش ناتوانین لە ناو جەرگەی ئەم سەرگوزەشتە بچوکەشدا ، لە ناو چاوگەی رۆشنبیریێ زانستیدا رۆستەمی زاڵی ئەو چەرخە فەرامۆش بکەین •

بەڵێ پیرەمێرد لە شاری سلێمانیێ بە شیلەی مێشکی و بە بیری تیژی والایێژی مرواریێ جوانی دروست دەکرد و دەیکردە گەردنی بەرزی خوێندەوارانی وشەی قەشەنگ و وتەی شیرینی دەهاویشتە ناو زمانی گەنجینەی بە پیزی کوردییەوە• کەلەپوری میللیێ تۆمار کرد• بە ناوی پەندی پێشینانەوە ئەدەبی کوردیێ دەڕازانەوە • بە دەستێ رۆژنامەی دەبردە رێوە ، بە دەستێکیتر قەلاچۆی نەخوێندەواریێ دەکرد •

هەر چەندە « حسێن حوزنیێ مۆکریانیێ » بە خۆی و چاپخانەکەیەوە

بەگژ ئۆردوی نوستن و نەخوێندەوارییەوە دەچو و بە وێنەی کاوەی ئاسنگەر ملی نابو بۆ هەورازێکی سەخت • شەو و رۆژی بە یەکەوە گرێ دەدا بۆ ئەوەی دەنکە گەوهەری بن دەریای ونبو هەڵێنجێنێ • تا بیخاتە سەر خوانی رۆشنبیری و ئاگری وریایی و راپەڕینی بەرپا بکا • هەر چەندە دەستەی « کوردی و مەریوانی » بە چاپخانە شڕەکەیانەوە ژیان و گیانی سەرلەنوێی « نالی و سالم و کوردی و شێخ رەزایان دەبوژانەوە بەرهەمە بە نرخەکانیان لە کلۆری ونبو و پەراگەندەدا زیندو دەکردەوە و بە نامیلکە بڵاویان دەکردەوە • گۆمی مەندی بەستەڵۆکی ئەو رۆژەیان دەشڵەقاند و لە هەوڵ و کۆششی خەستابون بۆ پێشکەوتنی زانستی و عیلم • بەلام لەگەڵ ئەمانەشدا هەموی ئەستێرەیەکی گەشی پرشنگداری ئاسمانی کوردەواری روناك کردبۆوە ، ئەمیش مامۆستا ئەمین زەکی بەگ بو کە توانی پاش تەقەلایەکی بە پێز و مێشك گوشینێکی زۆر و شەو نخونییەکی تەواوەوە شاکاری بەرهەمێکی گەورە بهێنێتەکایەوە ، کە ئەویش بریتییە لە « مێژوی کورد و کوردستان » بە دو بەرگ و لە ساڵی ۱۹۳۱ دا بە زمانی کوردی لە چاپ درا •

بەڕاستی لەم دوڕییانە مێژوییەدا هەرگیز ناتوانین هەوڵ و کۆشش بە پێز و دەوری باڵای مامۆستا ئەمین زەکی بەگ و دەست و قەڵەمی بە توانای لە مەیدانی زیندوکردنەوەی مێژوی کورد و رۆشنبیریدا بە کەم نیشان بدەین و نرخی تەواوی نەدەینێ و لە کاروانی رۆشنبیریدا جێگای دیاری کراوی خۆی بۆ دانەنێین • مامۆستا ئەمین زەکی جگە لەوەی مێژونوسێکی گەورەی کورد بوە پیاوێکی دانا و زاناش بو ، چونکە لەو باوەڕەدابو کە زانستی و زانیاری دەردی دەرمانی دواکەوتووی و هەژاری و کەساسییە • هەروەها هیچ درێغییەکی نەکردوە لە قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری و ئاوالاکردنەوەی دەرگای فێربون و پیشەسازی ، بۆیە هەمیشە ئامۆژگارکەری قوتابیان و

هاندەری لاوان بوە لەم رووەوە ، پشت و پەنای دەستەی کوردیٚ و مەریوانیٚ بوٚ ، کوٚڵەکەیەکی بە هێزی یانەی سەرکەوتن بوٚ •

بەڕاستی لەو چەرخەدا ناتوانین دەوری ماموٚستایان ، ئەمین زەکی بەگ لە مەیدانی مێژوٚ و توٚفیق وەهبیٚ بەگ لە روٚی زمانەوە فەراموٚش کەین، هەردوٚ لایان وەکو دوٚ شوٚڕە سواری کاروانی روٚشنبیریٚ گورزی گرانیان دادەوەشاند و رێگای تاریك و نوتوکیان بە چرای روٚناکیٚ مێژوٚ و گەوهەری وتەی کوردیٚ رەسەن روٚشن دەکردەوە •

لە ناو جەرگەی ئەم ململانیٚ و بەربەرەکانیٚ و تیٚکوٚشانە جوٚربەجوٚرە کە لە سەرانسەری کوردستاندا بەرپابوٚ ، مروٚڤ ئەگەر بەڕاستیٚ بڕوانێتە مێژوٚ پێویستە لەم قوٚناخەدا توٚزێك باسی دوکانی « سیموٚن ئەفەندیٚ »[3] بکات و مافی خوٚی بداتیٚ ، حونکە لەو روٚژانەدا چایخانە و هەندیٚ شوێنی ئاوەها بە یانەی سیاسیٚ دادەنرا ، کە بیٚ گومان ئەم جێگایانە دەوری بەرزیان دەگێڕا لە هوٚشیارکردنەوە و راپەڕینی خەڵکیدا • دوٚکانی «سیموٚن ئەفەندیٚ» دوکانێکی بچکوٚلەی کوٚنی سەر ئەو سوٚچەی شەقامی رەشیدە لە بەغدا کە دەچێتە سەر شەقامی « متنبي » و دەڕوا بوٚ بازاڕی سەرا و محاکم ، ئەم دوٚکانە هەرچەندە خاوەنەکەی ئەرمەنیٚ بوٚ کوردیشی نەدەزانی • بەڵام بوٚبوٚ بە جێگای دانیشتن و یەکتریٚ بینین و بیروڕا گوٚڕینەوە و گفت و گوٚکردنی سیاسیٚ، بە تایبەتیٚ لە روٚژانی هەینیٚ و جەژندا • دیارە عەشقی هاودەردیٚ و لیٚقەوماویٚ کورد و ئەرمەن سیموٚن ئەفەندیٚ خستبوە سەر ئەم خولیایە • ئابەم چەشنە گیانی برایەتیٚ و دوٚستایەتیٚ خوٚی دەربڕیٚ وپیشان بدا • لاوان و قوتابیان و پیاوە گەورەکان و نوێنەران و کاربەدەستانی ئەو روٚژە هەموٚ سەریان لەم دوٚکانە دەدا • بەڕاستیٚ دەورێکی سیاسیٚ لەو روٚژەدا

(٣) لە کەشکوٚڵی ماموٚستا نوریٚ کاکەحەمە ورگیراوە و لە روٚژنامەی هاوکاریدا هەندێکی لیٚ بڵاوکرایەوە .

دەگێڕا ، کە جێگایەکی تر نەبۆ بۆ یەك بینین و کۆبونەوە و گفت و گۆکردن.
شایانی باسە کە یەکەم جار لە ساڵی ١٩٤١ دا (١٤٠) کەس لە قوتابیانی کورد
لە ئوتێلی (شرق) لە شەقامی «نهر» کەوا ئێستا جێگای «مصلحة الحبوب»ە
کۆدەبونەوە و بۆ یادگاریش وێنەیەکیان بە گشتی گرت لە چوارچێوەیەکدا
لە دوکانەکەی سیمۆن هەڵیانواسی . ئەم سیمۆن ئەفەندییە لە مانگی شوباتی
١٩٧٥ لە بەغدا کۆچی دوایی کرد .

لە ناو جەرگەی ئەم دەشت و دەری سەرگەردانی پچڕپچڕییەدا لە بن
دەریای ئەم دەسەپاچەییەوە لە ناتەواوی و سەرلێشێواویدا کە هەر دەستە و
کۆڕ و کۆمەڵێك گرتبویانە بەر لە جم و جوڵ و چست و چالاکیا ، کۆمەڵی
لاوان جۆگەلە ئاوێکی رۆشنبیری رونـاك و بێگەرد بو . بنەوانێکی
شۆڕشگێڕی دوا رۆژ بو ، لانەیەکی سەختی چاوکردنەوە و داپەڕینی لاوان
بو . پشکۆ ئاگرێکی سور بون کە گەلی کورد ئومێد و هیوا و گەورەیی
دوارۆژی چارەنوسی خستبوە سەر ئەستۆیان . بەڕاستی ئەم دەستە لاوە
وەك پورەی هەنگ لە شەقەی باڵیان دەدا ، دەنیشتنەوە ، بەم گوڵ و گوڵزار و
کەژی کوردستانەدا کێوماڵیان دەکرد . لە کوێ روبار و کانیاوێکی سارد و
رون و سێبەر و درەختی سەوز و بەرزی چەم و نزاری بهاتایەتە رێگایان
هەوارگەیان دەخست و هەنگوێنی شەمە تلێنەکەیان دەهێنایە بەرهەم .
باشترین شاعیر و نوسەری ئەو چەرخەیان لە گەڵدا بو و جوانترین بەرهەمیان
لە ناو میللەتدا بۆ تۆمار دەکردن . کۆمەڵی لاوان لەو رۆژەدا چاوگەیەکی
وریابونەوە و چاوساغێکی بێ وێنەبون بۆ رونکردنەوەی شەقامی ژینی
تاریك و سەرکەوتن بە هەوڵ و کۆششی سەختیان ، روباری لێڵی قوڕاوی
رێگای رزگارییان رونـاك دەکردەوە . بـە بازوی پۆلاینیان دەرگای
سەربەستییان ئاواڵە دەکردەوە . بە چەکی خامەی رەنگینیان کوت و زنجیری
بیری کۆنیان هەپرون دەکرد . تۆوی بـیری نوێ و لێکدانەوە و

بیرکردنەوەی نوێیان دەکرد بە بالآی جولآنەوەی گەلدا •

ئێمە لێرەدا مەبەستمان لەوە نیە ئەم دەستە بەرز و نزم بکەینەوە • ئەمیان بگەیەنینە کەشکەلآنی فەلەك و ئەوی تریان بدەین بە ناخی زەویدا • یاخود بە سەنگ و بەرد و ترازوی ئەمڕۆ رۆشنبیری و پیاوی لێهاتو و لاوی جەربەزەی رابوردو بکێشین و نرخی بدەینێ • ترازوشمان بۆ کێشان و نرخ دانان بەم بەرهەمە شیرینە ئەو رێگاو ئەم بیر و باوەڕ و ئەو کۆڕ و کۆمەڵ و ئەم دەستە و تاقمانە بریتین لەوەی کە ئایا کام لایان ئەم کۆمەڵگایە هەنگاوێك بەرەوپێش دەبا و کونێکی تاریك بە چرای پێشکەوتن رونـاك دەکاتەوە و کەلەبەرێکی دواکەوتن بە تاشە بەردێکی ئاوەدان کردنەوە دەگرێ • کەند و کۆسپی رێگای سەرکەوتن بە هەوڵ و کۆششی بە پێز تەخت دەکا • گیانی شۆڕشگێڕی و بیری نوێ شێوەی تێکۆشانی تازە لە دڵ و دەرونْدا دەڕوێنێ و دژ بە بیری کۆنی رزیو و رێبازی تێکۆشانی وەخت نەماو دەدا • کۆمەڵی لاوان کە ئەو رۆژە هەردو نامیلکەی «یادگاری لاوان» و «دیاری لاوان»یان خستە ناو بازاڕی ئەدەب و مێژوی جولآنەوەی کوردەوە بە ناوەڕۆکێکی پڕ مانا و شێوەی نوسینی بەرز و رێبازی نوێ هەوێنی نۆ قازانی پێشکەوتن و راپەڕین بون و لەو سەردەمەدا بوبونە بنکەی شۆڕشگێڕی و وریابونەوە و لانەی بیرکردنەوەی تازە و بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری و زانست و هێلانەبون بۆ پێگەیاندنی نوسەر و شاعیر و تێکۆشەری کورد لە دوارۆژدا •

کۆمەڵی لاوان هەر لە هەوڵ کۆبونەوە بە هەردەوە دەگەڕان و خەرمانی کەلەپوری نەتەوایەتییان هەڵدەدایەوە ، بۆ گەوهەری شەوچرا دەگەڕان ، تا بیخەنە سەر خوانی کەڵك لێوەرگرتن • رابوردوی پڕشنگداری سەر گوزەشتەی گەلیان دەخستە بەر شەن و کەوی لێکۆڵینەوە و بە لاپەڕەکانی مێژودا دەچون تا کامی بە کەڵك و سودبەخش بێت بیخەنە بازاڕی

خوێندنەوەوە • ملیان بەسەر خوێندنەوەی بیری نوێدا شـــۆڕکربۆوە • تا وتۆی ئەم کتێب و ئەو کتێبیان دەکرد ، بە شوێن رێگای رزگاریێ و ئازادیدا وێڵبۆن • عەودالّی دۆزینەوەی دەرمانی دەردی کوشـــندەی گەل بـۆن • سەریان بۆ سەرچاوەیەکی رۆنی بێ گەردی سازگار دەنـــا ، تاکو لەوێـــدا هەوارگەی خۆیانی لێبخەن و ماندویەتێ دۆریێ رێگایان بشکێنن ، تینوێتێ بیری مێشکیان بە بیری نوێ زاخاو بدەن • تا لە دواییدا دەست بکەنە ملی هیوا و شادێ بنۆشن • لە ئەنجامی ئەم هەوڵ و کۆششەدا توانییان شـــیلەی بیریان ، بەری رەنجیان ، خوێنی دڵیان بڕژێننە سەر کاغەز و ئەم دۆ نامیلکەیە بکەنە دیاریێ دەستیان و پێشکەشی گەلی بکەن • بەم چەشنە ئاوات و خەیاڵی مەست و خۆزگە و هیوا و خولیای سەریان خســـتە ناو چوارچێـــوەیەکی دامەزراوی تۆکە و بە وشەی جوان و شـــێوەیەکی کوردیێ بەرز کردیـــانە گەردنی جۆڵانەوەی کوردەوە •

شایانی باسە وەکۆ لە هاوچەرخانی ئەو رۆژە بـــاسی لێوە دەکەن بـــە تایبەتێ مامۆستایان شاکر فتاح ، حامد فرج کە دامەزرێنەر و هەڵسوڕێنەری ئەم کۆمەڵەی لاوانە و بڵاوکەرەوەی ئەم دۆ نـــامیلکەیە کە بریتی بۆن لـــە مامۆستایان «فاضل رؤوف تاڵەبانێ ، شاکر فتاح ، حـــامد فرج ، حەســـەن تـــاڵەبانێ » •••

نامیلکەی یەکەم :

## « یادگاری لاوان »

### بەغدا ـ چاپخانەی کەرخ ساڵی ١٩٣٣

ئەم نامیلکەیە نۆبەرەی بەرهەمی شیرینی چەند لاوێکی دڵسۆزە کە بێ گومان بە شاکارێکی هەوڵ و تەقەلا شـیرەی بیری واڵابێـژی کۆمـەڵە شۆڕە سوارێکی ئەو چەرخە دادەنرێ کە دلێرانە هـاتنە کۆڕی مـەیدان و یەخەی دیوی تاریکی شەوەزەنگیان گرت و هەڵیان کوتـایە سـەر قەڵای نەخوشی و دواکەوتن ، رێبازی نوێیان لە رێڕەوی رۆشنبیری کۆمەڵـگای کوردا ئاواڵەکردەوە . بە رەنگی چەرخی چەپ گەرد رۆژگاری ناهەموار لـە توانایا نیە کە ئەم لایە رۆناکە مێژۆییە بسڕێتەوە ، ئەم یادگار و بیرەوەرییە لە دڵ و دەرۆندا کوێرکاتەوە ، یا ئەم ئەستێرە گەشە لە ئاسمانی رۆشنبیریدا بکوژێنێتەوە .

بەم نامیلکەیە ویستیان کە ناوی «یادگاری لاوان»ە خوێن گەرمەکان ببنە میرات گر و تەواوکەری ئەو رێگا پیرۆزە . بۆیەکە ویستیان بەم نامیلکەیە کە ناوی «یادگاری لاوان» بۆ ، یادی بێ دەنگی ئەو قەومـاوە گەورەیـە بکەنەوە . بیرەوەری ئەو رۆژە پڕشنگدارە بکەنەوە کە بە سەرەتای قۆناغی مێژۆیەك دادەنرێ لە سەرگوزەشتەی تێکۆشانی کوردا . لە هـەڵبژاردنی وشەی «یادگار» بۆ ئەم نامیلکەیە و لێكدانەوەی دێر بە دێری تاو و تۆکردنی

نوسینەکانی هەمۆی ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم دەستەی لاوانە رۆداوی شەشی رەشی ئەیلۆل زۆر کاری تێکردۆن و خوێنی شەهیدەکانی بەر دەرکی سەرا گیانیانی بزواندوە و دڵیانی هەژاندوە و بۆتە ماکی تێکۆشانیان و هێنانەدی ئەم کۆمەڵە بچۆکە • دیارە لەو هەل و مەرجەدا نەدەتوانرا بە ئاشکرا و سۆر بە سۆر لە شەشی رەشی ئەیلۆل بدوێن ، چونکە دام و دەزگای ئیمپریالیزم بە هەمۆ رەنگ دەیەویست شوێنەواری ئەم راپەڕینە کوێرکاتەوە و پەردەی لەبیرچونەوە بدا بە سەریا ، بۆ وێنە میری بە زۆری زۆردارەکی وەفدێکی داتاشراوی رێك خست تا پەردە و تارای سۆر بەرن بۆ عەرش ! هەروەها بۆ ئەوەی پیرۆزبایی ئەو کوشتارەی لێبکەن و بە مل‌کەچی لە ئاستی زۆرداری و ستەمی چینی فەرمانڕەوادا بڵێن دەستتان خۆش [1] نامیلکەکە بریتییە لە ٨٠ لاپەڕە و باسەکانی هەمە جۆرن • لە پێشکەشییەکەوە دەس‌پێدەکات کە بە ناوی لاوانەوە نۆسراوە • وەختێ مرۆڤ ئەم پێشەکییە دەخوێنێتەوە بۆنی بەیانێکی سیاسی لێدێت کە دەستەیەك لە لاوان پێشکەش بە گەل دەکەن و لە بەرنامەی کۆمەڵێك دەچێت کە دەخرێتە بەردەم هەتاکۆ لاوان پەیڕەوی بکەن و لە سەر رووناکی بەرێوە بڕۆن • شایانی باسە ئەم پێشەکییە هەمۆ رۆیەکی کۆمەڵایەتی ، سیاسی ، ئەدەبی گرتۆتەوە • دەرد و پەژارەی گیروگرفتی ئەو رۆژە دەردەخات و لاوان دادەنێت بە هێزێکی کاریگەری لێهاتۆی جەنگاوەر ، لە پێناوی خۆزگە و ئاواتی گەلا • بانگ لە لاوان دەکات و هانیان دەدات تا جێگای سروشتی خۆیان بگرن لە ریزی بزوتنەوەی نیشتیمانیدا و دایاندەنێت بە هەڵگری ئالای پێشکەوتن و

---

(١) ئامۆژگاری : مامۆستا شاکر فتاح لە دانیشتنێکدا گوتی : « ویستمان لە ساڵی ١٩٣٣ یادی شەشی رەشی ئەیلۆل بکەینەوە ، دۆ را هاتە گۆڕێ. یەکێکیان بریتی بۆ لەوەی کە خۆپیشاندانێك بکەین . ئەوی تریان کۆکردنەوەی پارە و یارمەتی‌یەك بۆ کە بدرێ بە ماڵە شەهیدەکان . لە دوایێدا بیری دووەم سەری گرت ، هەندێك پارەمان کۆکردەوە و لە رێگەی تۆفیق قەزازەوە درا بە ماڵە شەهیدەکان .

ڕوناککردنەوەی تاریکیی شەوە زەنگی ژیان • پێیان دەڵێت : بە بازووی ئاسنین ئێوە زنجیری دیلێتیی و کوێرەوەریی ورد و خاش دەکرێت • هەر ئێوەن بە تەنگ لێقەوماوان و داماوانەوە بێن و ببنە قۆچی قوربانیی بۆ رزگاریی و ئازادییان • ئێوەن دڵتان پڕە لە برایەتیی و ئاشتیی و خۆشەویستیی و لێبوردن، کە باری پێشکەوتنی گەلتان خستۆتە ئەستۆ • بەم چەشنە نرخ دەدا بە لاوان و دەوری گەورەیان لە ریزی بزووتنەوەی گەلدا دیاریی دەکات و لە پاشان باسی دایکی نیشتیمان دەکات و هاواریان بۆ دەهێنێت ، کە ببنە دایکێکی دڵسۆز بۆ گۆشکردن و پەروەردەکردنی رۆڵەکانیان • تا ببنە پیاوی دوارۆژی ناوداری سوودبەخش بۆ گەل و نیشتیمان • داوا لە کچانی ئەو رۆژە دەکات بۆ خەباتکردن لە پێناوی گەلدا و ببنە دایکێك دڵسۆز و خۆبەختکەر •

دوایی دێتە سەر باری کوردایەتیی و داوا دەکات کە پێویستە منداڵ هەر لە سەرەتاوە زمانیان بە کوردیی بپشکوێ و گوێیان بە بیستنی دەنگی کوردیی بکرێتەوە • چاویان بە دیمەنی جوانی شاخەکانی کوردستان هەڵێنن • دیارە ئەم دەستەیە هێشتا بە کاڵ و کرچیی دەڕواننە باری کوردایەتیی • هێشتا هەر لە قۆناخی شمشاڵ لێدەری بیری نوێ دان مێشکیان ئەوەندە بیر دەکات • دڵیان هەر ئەوەندە لێ دەدات • نەگەیشتوونەتە رادەی بیرکردنەوەیەکی قووڵ بۆ لێكدانەوە و شیکردنەوەی دەرد و پەژارەی کۆمەڵایەتیی • دەگەڕێن بە شوێن چرای راستەقینەدا بۆ ڕوناککردنەوەی رێگای خەبات و چاو ساغیان بەدیی نەدەکردەوە ، بۆیە هەر هەردە و کێو و کەژ و ماڵ دەکەن بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەیەکی روونی بێگەرد کە لە دواییدا تینوێتیی ماندووبوونیان دەرچێت ، تا دوایی جۆگای گەورەی تێدا ببەسترێت • ئیتر تێر ئاوی روون و سازگاری لێبخۆنەوە • ئەمەش دەقی ئەو پێشکەشییەیە :

پێشکەشــە :

بۆ ئەو لاوانەی درەوشی پێشکەوتن هەڵدەگرن ...
بۆ ئەو خورتانەی رێگای تاریکی ژیان بۆ کۆمەڵیان رۆناكدەکەنەوە..
بۆ ئەو بازۆ ئاسنینانەی زنجیری گیرۆدەیی دەپچڕێنن ...
بۆ ئەو دڵسۆزانەی گوێیان لە گریان و هاواری هەژاران بوە ...
چاویان بە کەساسی و لێقەوماوی داماوان کەوت و بە دەنگیانــەوە دەچن و یارمەتییان دەدەن ...

بۆ ئەو گیانانەی پڕیــانە لە برایــەتی و ئاشــتی و خۆشــەویستی و لێبوردن ...
بۆ ئەو پاڵەوانانەی باری پێشکەوتنی وڵاتیان وا بەسەر شانەوە...
بۆ ئەو دڵانەی بۆ خۆشەویستی لێدەدەن ...
بۆ ئەو زارانەی کە وارەکەیان وەکو برۆسکە شەوەزەنگمان رۆناك دەکاتــەوە ...

بۆ ئەو دایکانەی منداڵەکانیان بە ناوی خدمەتی وڵاتەوە گۆش دەکەن..
بۆ ئەو کچانەی دایکی دوارۆژن ...
بۆ ئەو کوڕانەی خاوەنی سبەینێن ... بۆ ئەو منداڵانەی زمانیان بــە کوردی دەپشکوێ ... گوێیان بە بیستنی دەنگی کوردی دەکرێتەوە ... چاویان بە دیمەنی شێوەی شــیرینی کەژ و کێوانی رەنــگینی کوردستان هەڵدێ .. بۆ ئەو دڵانەی خۆشــەویستییەکی پــاك و بێ هــۆی کورد و کوردستانی تیایە .. بۆ ئەو کەســانەی بڕوایــەکی تەواو نەگۆڕاویــان بە سەرکەوتن و ژیانەوە و وریا بوونەوەی کورد هەیە ...

بــۆ ژیــن ...
بۆ هیــوا ...
ئەم یادگارە پێشکەش دەکەین .

یادگاری لاوان لە ساڵی ۱۹۳۳ دا لە بەغدا دەرچوو • کۆمەڵە لاوێکی خوێنگەرمی ئەو ڕۆژە پشت بە خۆ ئەم ئەرك و فرمانە پیرۆزەیان خستە سەر شانیان ، زۆربەیان لە بەغدا لە کۆلێجی حقوق ، دار المعلمین ، طب دەیانخوێند • لە نێوان خۆیاندا نیمچە رێککەوتنێك و یارمەتیدانێکی یەکتری دروست بوبوو • دیارە بەستنی پەیمانی دیلێتی ۱۹۳۰ شتێکی گەورەبوو بۆ خۆشکردنی ئاگری بەرگری ، تیژکردنی گیانی بەربەرەکانێتی پارتە نیشتیمانیەکان و پیاوە ناسراوەکانی وڵاتی ئەو ڕۆژە • بە وتار خوێندنەوە ، بە نوسین ، بە کۆڕبەستن و بە وشەی جوان •• بە وتەی شۆڕشگێڕی بیری نوێیان لە ناو گەلدا دەچاند • بە تایبەتی لەم هەل و مەرجەدا « دەستەی ئەهالیش درێغیان نەکرد و لە هەوڵ و تەقەلادان ، بێ وچان بۆ بڵاوکردنەوەی بیری نوێ دژ بە ئیمپریالیزم و هاندانی گەل ، بۆ بەربەرەکانیکردنی دام و دەزگای بۆگەنی فەرمانڕەوا ، بە تایبەتی هەندێ هەل و مەرجی ناوخۆیی و جیهانی لەو ڕۆژەدا کۆبوبۆوە بۆ ئەوەی ببێتە هەوێن بۆ وریابونەوەی راپەڕین•باری جیهانی بە تایبەتی گیروگرفتی ئابوری جیهانی کە لە ۱۹۲۹ وە تا ۱۹۳۳ دەستی پێکرد و درێژەی کێشا و لە عێراقدا کاری خۆی کرد • ئەویش بە هۆی بەستنی عێراق بە ئابوری بەریتانیا و لە دواییدا بە پێی دابەشبونی بازاڕی ئابوری جیهانی بۆ دو بازاڕ : بازاڕی سۆشیالیستی لە یەکێتی سۆڤیەت بە تەنها و بازاڕی ئابوری سەرمایەداری لە هەمو جیهانی سەرمایەداریدا ، بەم رەنگە نزمی و بەرزی ، تێکچون و گەشەکردن هەمو نەخۆشییەکی ئابوری سەرمایەداری جیهانی لە عێراقدا دەنگی دەدایەوە و کاری خۆی دەکردە سەر بار و دۆخی کۆمەڵایەتی • بۆیەکا ئەم گیروگرفتە ئابورییە دەستێکی گێڕا لە بەرپابونی مانگرتنی کرێکاراندا لە یەکی تەموزی ۱۹۳۱ دا لە بەغدا بە چەشنێ کە ئاگری ئەم

مانگرتنـه وەکو «محمد صـالح قزاز» [٢] دەڵێت ، بەغـدا و شـارەکانی خوارۆی عیراقی گرتەوە دیارە بێمەڵامەت نەبۆ کە «ملك فیصل» [٣] داد و بێداد دەکات لـەم رۆژەدا لـە بارەی دۆخی عێراق و لە یادداشـتە بـە ناوبانگەکەیدا کە بۆ هەندێ پیاوانی عیراق لەم بارەیەوە ناردۆیەتی کە دۆ وێنەی بچۆك بۆ پیشاندانی باری ناسازی عـیراق دەهێنێتەوە • یەکێکیان مانگرتنی کرێکارانی بەغدایە و دووەمیان شۆڕشی شێخ مەحمۆدە و دەڵێت « حکومەت لە گەل بێهێزترە • گەل زیاتر لە سەد هەزار تفەنگی بەرامبـەر بە ١٥ هەزار تفـەنگی حکومەت هەیە • لەبـەر ئـەوە پێویستە هێزێکی چەکداری ناوخۆی ئەوتۆ پێك بهێنن کە بتوانێت ئامادە بێت و لە یەك وەختدا دۆ شۆڕش لە دۆ شوێنی دۆر لە یەکدا دابمرکێنێتەوە » •

بەڕاستی فەیسەل لە یادداشتەکەی ساڵی ١٩٣٢ دا باشـس بۆی چوە ، چونکە لەو سەردەمەدا کێشەی کورد و کێشەی کرێکاران دام و دەزگای ئیمپریالیزمیان هێنابوە لەرزین و لەقەلەق • دیارە کۆمەڵی لاوان کە قاڵبۆی ئەو رۆژە بۆن پێویسـتی تێکۆشانی ئەو سـەردەمە هێنابۆنیە کایەوە و خستبۆنیە سەر شانۆی مێژۆ • کۆمەڵەی لاوان بە گشتی رۆڵەی هاوچەرخی شەشی رەشی ئەیلۆل بـۆن • زمانی حاڵی پێشاندانی ئـەو دەورە بۆن • نوێنەری راستی ئەو کۆمەڵگایە بۆن ، بۆیەکا بە سەنگ و بەردی ئەو رۆژە خەڵـەو خەرمانیان دەپێوا و بـە پێی قۆناخ و پلەی جۆڵانەوەی کوردی

(٢) محمد صالح قەزاز : سەرکردەیەکی نقابی بە ناوبانگی کرێکارانی ساڵانی سی بۆ ، دەورێکی باڵای نواندوە لە رێکخستن و راپەڕینی کرێکاراندا بۆ گەیشتن بە مافی رەوایان و بۆ هەشت سەعات کارکردن و باشکردنی گوزەرانیان و لەم رێگەیەدا دوچاری گرتن و دۆرخستنەوە بوە و لە ساڵی ١٩٣٦ دا لەگەڵ مامۆستا « کامل چادرچی و دەستەیەکدا بۆ بە یەکێك لە دامەزرێنەری « جمعیة الاصلاح الشعبي » . رۆژنامەی ئیستیقلال ، ساڵەکانی ٣١ هەتاکو ٣٧ .

(٣) مذكرة ملك فيصل الاول عن كتاب «اوراق ناجي» .

هەنگاویان هەڵدەهێنا تا ئەمانیش لەم تولە رێگەیەوە شتێك بە شتێك بکەن و بەردێکی بچوك بخەنــە دیواری بەرزی تێکۆشـــانی نەسرەوتی گەلەوە • نامیلکەکە کە بێجگە لە پێشەکییەکە کە بە ناوی لاوانەوەیە دێتە سەر باسێکی تر بە ناوی « شێن بۆ گوڵێك » کە بریتییە لە پارچە پەخشـــانێکی ئـــەدەبیَ بەرزی دڵتەزێن و قوڵ و کوردییەکی پاراو کە ئێستای خوێندەواری کورد دەیخوێنێتەوە دڵ و دەروونی دەهەژێنێ و زاخاو بە مێشکی گەرم و گوڕیشی دەدا بە شێوەیەك کە تەڕیَ و بڕییەکەی هەر پێوە دیارە • ئەم پەخشانە بریتییە لە گفت و گۆیەکی جەرگبڕی بۆنکڕوزاویَ نێـــوان هەژارێکی داماو و گوڵێکدا، کە سەرگوزەشتەی دوَ چەرخ و دەوری جۆر بە جۆر دەگێڕێتەوە• دەوری یەکەمی هەردوَلایان پڕبوَ لە ئازادیَ و شۆخ و شەنگیَ و بەختیاریَ ، کە لە لوَتکەی هـــەزار بە هەزاری ســـەرکەوتندا وەك بلبلی خۆش ئـــاواز لەخوێندندا بوَن و لە کۆشکی بەختیاریَ و کامەرانیدا دنیای شادییان بەسەر دەبرد • بەڵام لە دەوری دووەمدا هەر دوَکیان پەل و پۆیان دەشکێ و لە تەختی بڵندی کامەرانییەوە دەکەونە چاڵی کەندەڵانی مردن و کەساســـیَ و داماوییەوە و بن دەریای بەد بـــەختیَ و نائومێدییەوە • بـــەڵام لە دواییدا دەرمانی ئەم دەردە کوشندەیەت بۆ دەسنیشان دەکات و گیانی نەبەزین و باوەڕ بە سەرکەوتن بە باڵای گەڵدا دەکا و خەڵکی لە خەمی دۆش دامان و ورەبەردان رزگار دەکا و دەڵێت :

« مەمێنە •• بمرە با بەســـ روَی گرژ و موَنی گەردوَن نەبینی ، بەس چنگی خوێناویَ زۆردارمان چاو پیَ بکەوێت ، بەس ناڵەی دڵ توێنەوەی هەژاران و گریانی بـــە کوڵی داماوانمان بێتە گویَ • با بەســـ نەڕەی خۆ هەڵکێشانی خۆپەرستان ببیسین •

بمرە •• مردن لە رێگای خۆ رزگار کردنـــدا گەلێك چاکترە لەوەی

ئازاری گیرۆدەیی ناو قەفەس هەڵگری • مەوێستە گیانە بڕۆ ، شیرینم بڕۆ بمرە بۆ ژیان » •

بەم چەشنە ئەم پەخشانە وێنە و روخساری ئــەو رۆژەی کۆمەڵگای کوردت بۆ دەر دەخات و لە ئاسۆیەکی بەرزی پڕ ئاوات و ئامانجەوە دەتخاتە کەندەلانی زیندان و مردنەوە ، بەلام لــە دواییدا رات‌دەچەڵەکێنێ ••• و هاوارت لێ دەکا کە مەوەستە •• راپەڕە ، تێکۆشــە ، تۆڵەی دواکەوتن بسێنە • بمرە ، خۆت بەخت کە لە پێناوی ژیان و سەرکەوتن‌دا ، کە ئەمەش دەقی ئەو پەخشانەیە :

## « شــین بۆ گوڵێك »

«هەژار : گوڵە سیسەکە تۆش وەکو من لێ قەوماوی ، داماوی • تۆ دوێنێ رەنگین و خەندان و تەڕ و تازە بە چڵی خۆتەوە دەشەکایتەوە ، منیش شاد و رووخۆش بە دەم شــنەی ژینەوە دەشنامەوە ، تۆ دەســتی زۆردار بیچڕێنی • من گێژەڵوکەی پەژارە لە بیخ و بنی هەڵکەندم • تۆ دوێنێ جوانی گوڵشەن بوی ، شەونمی خاوێنی سەر لێوت پێشکەشی دەکرد بە مرواری ملی رستاری خۆش‌ویستن ، منیش فرمێسکی شادی چاوم دەهۆنمەوە بــۆ گەردانەی گەردنی شیرین • تۆ ئەمڕۆ سیس بوی ، پەڕەکانت بەسەر یەکا چوە ، گوڵ و گەلات وەریوە ، شێوەت پەشێواوە ـ ژاکاویت •

منیش خەم تێکی‌شکاندوم ، هێزی ئەژنۆم نەماوە ، پەڕەی دڵم بەرگەی خورپەی خۆری بێ سامانی ناگرێ • تۆ دوێنێ بولبولانی دەنگ خۆش بە رووتــەوە پێ‌دەکەنین ، ســۆزەی بەیان پرچی ئالۆزاوی شــانە دەکردی ، رۆشنایی خاوێنی رۆژ چاوی بە کلی هۆشیاری دەڕشتی •

منیش لە کۆڕی دڵدارانا یەکە بەختیار لە باخی دڵاندا یەکانە گوڵێکی

گەش لە ئاسمانی خۆش‌ویستندا تاکە ئەستێرەی پرشنگداربوم ، کیژان لە سەر زەردەخەنەیەکی زارم بناغەی هەزاران کۆشکی هیوایان دادەمەزران، جیهان لە بەردەم ئارەزوۆدا ملکەچ کەوتبو •

ئەمە هەموی دوێنێ •• دوێنێ •• ئاه •• چ خەوێکی خۆش‌بو نەهاتە دێ ، بەلام ئەمڕۆ لە سەر تەختی بڵندێ کەوتمە خوارەوە ، ئەستۆم بو بە پۆل و بومە نێچیری بەردەستی میکرۆبان • هەروەها سبەینێ دەبمە خۆراکی سەر سینەی قەل و داڵ و مار و مێرو :

بەلێ سبەینێ دەبیتە خاکی سەرەزێ ، زۆر لەوانەی کە دوێنێ دەیان‌خستیتە سەر سەر پێ بە سەرمانا دەنێن ، لە گەلێك یادا پەردەیەکی ئەستور بە سەر ناوماندا دێنن • لە بیردەچینەوە •

بەلام تۆ •• تۆش هەژارێکی وەکو من سبەینێ دەبیتە خاك و تێکەلی گڵ دەبیت ، تۆ ئەو گولەی کە چەند جار سنگی کیژانت رازاندۆتەوە ، دەروازەی شاری دڵانت کردۆتەوە ، بە بۆنی خۆشت مۆتەکەی پەژارەت لە سەر سنگی هەژاران لابردوە ، بە پشکوتنی خونچەت گولی هیوات لە دلی هەژاراندا گەشاندۆتەوە ، بە شێوەی شیرینت دلداریت لە دلی هەژاراندا گلپەی سەندوە ، هەزاران جار قسەهۆنان « شاعران » بە گۆنای یاران و لێوی جوانان ناویان لێ ناوی ، سبەینێ کێ دەزانێ ئەو گلە ئەم گولەیە ؟!

کێ دەزانێ بە سەر تەن و مەنی نەژیاویا دەڕوا ؟ کێ دەزانێ بە سەر لاشەی جوانانـدا هەنگاو هەلدەنێت ؟ کێ دەزانێ ئەو خۆلەی کە پێی خۆپەسەندی پیا دەنێ دلی منداڵێکی ساوا ، مێشکی گەنجێکی نامراد کە لە بەری ژینی نەخواردوە ، یان سنگی ژنێکی هەژارە کە تامی شادێ نەچەشتوە ، یان روی گولێکی شیرینە کە دلۆپێ شەونمی نەکەوتۆتە سەر رو ، کێ دەزانێ چ کەسە ؟

مەمێنە بمرە •• تـوش وەکو منی •• من و تۆ هاودەردین ، تۆ بـە برژانگی شۆڕ و من بە چاوی گلۆفراوما ، تۆ بە رەنگی ئەرخەوانی و من بە فرمێسکی خوێنینمدا • تۆ بە ژیانی کورت و من بە رابواردنی کۆتاما لەیەك دەچین •

مەمێنە •• بمرە ، گیانی شیرینم : چاوی پێ‌هەڵهێنانەوەت لێك‌بنێ ، ئەستێرەی بۆنمان لە کۆڕی نەبۆندا ئاوابۆ • گلۆڵەمان کەوتە لێژێ ، هیچ دڵت لە خۆت نەمێنێ ، تۆ دەست لە چڵێ بەرئەدەی من لە هەزار ، تۆ بـە هیوای شەونمی خاوێنی پرشنگی شنەی نەسیمی • من بە هیوای هەزاری وام کە تۆ ئەتەوێ هەنگ زاری شـیرینت بمژێ ، منیـش ئەمەوێ لێوی شیرینم بگەزم •• مەوەستە بڕۆ ، وەستان چ کەڵکێکت ناگرێ •

مەمێنە بمرە •• با بەس ڕۆی گرژ و مۆنی گەردۆن ببینی • بەس چنگی خوێناوی زۆردارمان چاو پێ‌بکەوێ ، بەس ناڵەی دڵ توێنەوەی هەژاران و گریانی بە کوڵی داماوانمان بێتە گوێ • با بەسـس نەڕەی خۆهەڵکێشانی خۆپەرستان ببیسین •• بمرە •• مردنی هۆزار لە رێگەی خۆ رزگارکردنا گەلێك چاکترە لە وەی ئازاری گیرۆدەیی ناو قەفەس هەڵگرێ • مەوەستە گیان فیداکەری وڵاتەکەی • هەروەها بانگی ئافرەتان دەکات بۆ فێربۆن و

باسی دوایی بە ناونیشانی « ژن » بریتییە لە پەخشانێکی کۆمەڵایەتی کە دەوری باڵای ژن لە کۆمەڵدا پیشان دەدا ، هەر وەکو چیمەن بە گوڵەوە جوانە ، ئاسمانیش بێ ئەستێرە نابێت ، کۆمەڵی ئێمەش بە ژنەوە بەندە ، واتە کۆمەڵی بێ ئافرەت وەکو درەختی بێ بەر وایە • لێرەدا باسـی جاندارك دەکات و دەیکاتە نمونەی ئازایەتی و قارەمانێتی کە توانی ببێتە پاڵەوانێکی گیانە بڕۆ •• شیرینم •• بڕۆ •• بمرە بۆژیان » •

خوێندەواری ، تابنە دایکێکی هاوچەرخی نوێ و ئەرکی سەرشانی خۆیان بزانن بەرامبەر بە کۆمەڵ و گەل و نیشتیمان • ئەم پەخشانە « ع ــ ت »

نوسیوێتییەوە و لە ئەنجامی پرسینەوەدا بۆم دەرکەوت کە ئەم ناوە «عارف تاڵەبانی»یە ، کە وەختی خۆی لە بەغدا قوتابی بوە •

باسێکی تر بە ناوی « شەو » کە نوسەرەکەی « ش• ف »یە مامۆستا « شاکر فتاح »ە ، کە بریتییە لە پەخشانێکی ئەدەبی ، بە بەژن و باڵای شەودا هەڵدەدا بە قەڵای مێرد و رابەری دۆست و دڵدارانی دادەنێ •• لەم بابەتە ••• هتد •

دوایی دێتە سەر هۆنراوە :

هۆنراوەی « یادگار و هیوا » هەر چەندە ناوی بە سەرەوە نیە ، بەڵام ئەوەندە بە ناوبانگ و دڵگیر و بەرزە ، هەمو خوێندەوارێکی کورد دەیزانێ کە هی « کێیە »ە • وا بزانم پێویست بە باس‌کردن ناکات چونکە رۆشنبیرانی کورد بە ترازوی ئەدەبی کێشاویێتی و نرخی خۆی داوەتێ •

دوایی دێتە سەر نوسینی « سەربەستی منال » ، پەخشانێکی کۆمەڵایەتی و پەروەردەییە بۆ باوك و دایکان کە شێوەی ئامۆژگاری وەرگرتوە بۆ ئەوەی رێبازی ئەو ئامۆژگاریانە بگرن بۆ پێگەیاندن و گۆش‌کردنی منداڵان ، تا لە دواییدا ببنە پیاوێکی بە نرخی دوارۆژ و سود بەخش بۆ ئەم گەلە • نوسەری ئەم نوسینە « ج • م » ە • لە ئەنجامی پرسیندا دەڵێن خوالێخۆشبو « جمال مجید سلیم » ە کە وەختی خۆی ئەفسەر بوە • پاشان دو هۆنراوەی مامۆستا « گۆرانی » تیایە ، یەکێکیان « هەوری پایز » و ئەوی تریان « گەشتی هەورامان » • هەروەها هۆنراوەیەکی « بێ‌کەس » یشی تێدایە بە ناوی « سکاڵا لەگەڵ مانگا » لەگەڵ هۆنراوەیەکی مامۆستا « زێوەر » بە ناوی « بەهارێ » و پاشان نوسینی « دەرد و دەرمان » دێت • پەخشانەکە باسی دەوری کۆمەڵایەتی و دەردی سروشت دەکات • هەروەها نوسینێکی کۆمەڵایەتی و سودبەخشی تێدایە بە ناوی « م • أ » کە لە ئەنجامی پرسیاردا دەڵێ « محمد عبدالرحمن پاشا »یە •

دوایی دێته سەر نوسینی « شاعیرەکانمان » کە بریتییە لە گۆشەیەکی ئەدەبی٠
لێرەدا نوسەر مامۆستا « ٠٠٠٠٠ »ە کە زۆر بە توندی رەخنە لە شاعیرەکان
دەگرێت و نرخ و گرنگی هۆنراوە دەردەخا لە پێشکەوتنی و سەرکەوتنی
گەلدا کە دەڵێت :

[ بەسە ئیتر باسی یادی ئەسکەندەر ، ئاوی بەقا ، جامی جەم ، ماهی
کەنعان و عەزیزی میسر ، تا کەی لەسەر ئەم رێزەوە دەڕۆن و لە کێشەی
دەردی کۆمەڵایەتی خۆمان دور دەکەونەوە ، تا زوە رو بکەنە گەل و
نیشتیمان و جوانی سروشتی وڵات بکەن بە قیبلەگاتان بۆ هۆنراوە ٠
گیر و گرفت و دەرد و خەفەت ، خۆشی و تاڵی گەلەکەتان بکەن بە نیشانگا ٠
رو بکەنە وێنە و روخساری کۆمەڵگای کورد ٠ وەرنە سەر باسی چۆن بەهێ
مەڕ ئەدۆشێ، شیرین تەشی ئەڕێسێ و مەشکە ئەژەنێ٠ نازدار بە شل و مل لە
رەز ئەگەڕێتەوە ٠ وەرنە سەر باسی سروشتی بەرزی کێو و کەژە جوانەکانی
کوردستان ٠ شاخ و کێوی لوتکە گیراو لە ئاسمان ٠ چەمی خوڕ و دارستانی
زەبەند و چڕ ٠٠٠ هتد ٠ دەست هەڵگرن لە لاسایی کردنەوە و چاولێ کردن ]٠
بە کورتی داوای ریالیزمێکی ئەدەبی دەکات ٠

دوایی دێتە سەر نوسینێکی تر بە ناوی پارێزگای چاو کە لە نوسینی
( ع ٠ غ ) کە ئەویش « د ــ عبدالرحمن عبدالله »یە ٠ دوایی نوسینێکی تر
بە ناوی ( شەرمن ) کە باسی خوویەکی ناشیرینی کۆمەڵایەتی دەکات و داوا لە
هەمو لایەك دەکات کە ئەم نەخۆشییە پیسە قەلاچۆبکەن ــ بە ناوی
« ع ٠ س »ەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی ٠ هەروەها چیرۆکێك بە ناوی
« کردەوەی دەروێش » کە لە نوسینی ( هـ ) یە ٠ هەروەها نوسراوێك بە
ناونیشانی « ژیان چییە » کە ئەویش نوسینێکی وەرگێڕاوە لەگەڵ
فۆلکلۆرێکی کوردی « مام ورچ » کە لە نوسینی مامۆستا ( شاکر فتاح )ە ٠

له پاشان بــه نوسینێکی تەندروستی و چەند قسەیەکی نەستەق و بەنرخی « تۆلستۆی و فیکتۆر هۆگۆ » کۆتایی پێدێت •

**ناميلكەی دوەم :**

**سەرەتای ئیش هەمو یەكبونە ، ئەویش نابێ هەتا**
**هەر برینێ كە لە دڵدا هەیە ساڕێژی نەكەی**

**( شكری )**

## دیاریێ لاوان

**لاوان**

لە چاپخانەی بەغدا چاپ‌كرا •

بەغدا ـ ١٩٣٤

ئەم ناميلكەیە بريتییە لە ٩٨ لاپەڕە • بە چەند باسێكی جۆربەجۆر رازاوەتەوە ، كە هەر یەكەیان گەوهەرێكە و لە بن دەریایەك هەڵێنجراوە • لەپێشەوە بەم سەرەتایە دەست پێ دەكات •

**پێشكەوت**

ئەوا پشت بە گەورەیێ خوا و یارمەتێ هەندێ مەزنان و خاوەن بیرەوە ئەمساڵیش توانیمان بە ناوی «دیاریێ لاوانەوە» دیارییەك پێشكەش بكەین ، هیوامان وایە كە ئەم تەرحە نوسینانە كەڵكیان هەبێ بۆ گەلەكەمان • چونكە بێجگە لەوە كە گەلێ پەند ، ئامۆژگاریێ ، شیعر ، چیرۆك و قسەی بە

فەڕیان تیایە ، بۆ پێشکەوتنی زمانەکەمان و بە تـایبەتی بۆ ڕێـکخستنی و جوانکردنی چەشنی نوسیاری کوردی هەنگاوێکە بۆ پێشەوە •

« لاوان »

کۆمەڵی لاوان هەر چەندە بە ژمـارە وەکو هـەندێ لە مامۆســتا و بەڕێوەبەرەکانی دەیڵێن لە نێوان ٦٠ ــ ٧٠ قوتابی تێدا بوە ، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها چەند لاوێك مۆمی سوتاو و کۆڵەکەی ئەستور و ئاگر خۆشکەری ئەم کۆمەڵە بون • چونکە لە هەمو بزوتنەوە و ڕاپەڕینێکی شۆڕشگێڕیدا تەنیا دەستەیەك دەبێتە پێشەنگ ، بنکە ، بنەوان ، ئاڵاهەڵگر و دەمڕاست • لەبەر ئەمە دەتوانین هەندێکیان هەڵبژێرین یـان دابنێین بە کۆڵەکە و جڵەوکێش و بەڕێوەبەر • بۆ نمونە لە شاعیرەکاندا وەکو زێوەر ، گۆران ، شێخ سەلام ، بێکەس ـ کە ئەمانە لەو سەردەمەدا نە قوتابی بونە و نە لە بەغدادیش بون • بەڵام هاودەرد و هاودەنـگی ئەو قوتابییـانە بون • گیانیـان بۆ یەکتری لێدەدا و هەردو لایان بە گیانێك دادەنران ، بۆیەکا دەتوانین هەندێك لـەم نوسەرانە بە کۆڵەکە و پێشڕەوی کۆمەڵەکەی دابنێین • ئەوەی شایانی باسە با بڵێین لەو سەردەمەدا ژیانی پارتایەتی زۆر کرچ و کاڵ بوە بۆیە بوەتە هۆی دەستەپاچەیی و جوڵانەوەی نیشتیمانی قاڵ نەبوبو لە تێکۆشانی حیزبایەتیدا، جگە لەوەی کە کۆمەڵگای عیراق هێشتا ئاوس نەبوبـو بە کۆڕ و کۆمـەڵی هاوچەرخی ڕێكوپێکی تـەواو •

ئەم دەستەلاوانە ، دەرکردنی ئـەم دو نامیلکەیە ڕێکی خســتبون و پەیوەندی گیانی هاوبەشی و خزمەتکردنی گەل و نیشتیمـان پـاڵی پێوە نابون و وەکو هەندێك لە خۆیان دەڵێن : جار و بار دەچوینە ماڵی مامۆستـا تۆفیق وەهبی و زاخاوی دڵمـان لـەوێ بە پێزکردن و نوسـینی کوردی دەدایەوە، یان لە چایخانە و جێگای تردا یەکتریمان دەبینی • واتا کۆبونەوەی

تایبەتیشیان نەدەکرد بەڵام لە نێوان خۆیاندا پارەیان کۆدەکردەوە بۆ بەڕێوەبردن و چاپکردنی نامیلکەکە کە (١٥٠٠) ژمارەیان لێ دەردەکرد •

دوایی دێتە سەر نوسینێکی مامۆستا « ر • ن » ئەویش کە بەڕێز « رەشید نەجیب »ە •

## وەلی دێوانە

### ژین وشیعری

زیندوکردنەوەی یادی شاعیرێکی وەکو وەلی دێوانەی چۆڵپەرست و کۆچەری هەژاری نەخوێندەواری دڵپاکی سادە و بە کام نەگەیشتوی ، دەست لە ملی هیوا نەکردوی دەشتی ونبوی لەبیر چودا ، بە کارێکی گەورە و ئەرکێکی پیرۆز دادەنرێ • بانگڕاهێشتنێکە بۆ وریابونەوە و راچەڵەکینی خوێندەواران ، بۆ گەڕان و پیاچونەوە بە داستانی پڕ شانازی و بەهرەوەری گەل و هاندانی رۆشنبیران بۆ چونە پێشەوە بۆ بوژاندنەوە و کۆکردنەوەی کەلەپوری میللی و شارەزابونی مێژوی بە نرخداری گەل ، بۆ ئەوەی شاعیر و هونەرمەند و گەورە پیاوانی کورد جێگەی سروشتی دیاریکراوی خۆیان وەرگرن •

کۆمەڵگای کورد زیاتر لە (٢٠٠) ساڵ پێش ئێستا و لە ناو جەرگەی گەرمیان و کوێستانی عێلی جافدا رۆڵەی وەکو وەلی دێوانەی گۆشکرد و دڵ و دەرونی هەژاند و زمانی خستە کار و کەوتە سەودای شیعر وتن و بە وێنەی مەجنون کەوتە داوی شەمەوە و لە پێناوی ئەم دولبەرە بەژن و باڵا جوانەی جاف کەوتە کێو و کەژ و نزارەوە و فرمێسکی نائومێدی دەڕشت و داخی دەکرد بە هۆنراوەی شیرین و نەمر کە ئەمە نمونەی هۆنراوەیەکێتی :

**یـاران وەسـیّتم ئەمە بێ لاتـان**
**هەرچەند کەوتـوّمە دوّرە ولاّتـان**

که تا ئەمڕۆش بوەتە ویردی زمانی هەمۆ خوێندەوار و ئەدەب دۆستێك و بەم چەشنە وەلی دێوانە بـەرزێ خۆی لـە مێشك و دڵ و دەروونی گەلدا کردۆتەوە و بوە بە شاعیرێکی نەمر .

دوایێ لە گۆشەی چیرۆکی کورتدا و لە ژێر ناونیشانی « سەرخۆشێ شێتییە » کە لە نوسینی «م. ع. کوردێ » یە کە دیارە لە نوسینی « محمـد علی کوردی »ی مامۆستای مدیری ناحیەی کۆچ کردۆ .

چیرۆکەکە چـیرۆکێکی کۆمەڵایەتی و تـەڕ و بڕ و دڵرفێنە و بـە شێوەیەکی کوردێ رێك‌وپێك داڕێژراوە ، باسی بێ وەفایێ مێردێك دەکات لەگەڵ ژن و ماڵەکەیدا مۆری ریسوایێ و بەد خۆیی بە تەختی ناوچـەوانی مەست و سەرخۆشێ پیاڵەوەوە دەنێ ، کە ناوەڕۆکی چیرۆکەکە بریتییە لـە پیاوێك کە لە پێناوی هەوەس و ئارەزۆی تایبەتێ خۆیدا کونجی مەیخانـە دەگرێ و سەرخۆشێ دەکاتە پیشەی هەمۆ رۆژێکی و ژن و ماڵ و منداڵەکانی فەرامۆش دەکات و هەرچی هەیە و نیە لەسەر مێزی خواردنەوەی دادەنێت ، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ژنەکەی لە ناو کۆشی نەخـۆشێ و پـەژارە و نەبۆنیدا بتلێتەوە . کە نیوە شەوێك بە سەرخۆشـێ دەگەڕێتـەوە کچـە وردیلەکەی دەبینێت کە دەسـتی لە ملی دایکی ئالاّنـدوە و وا دەزانێ کە هەردۆکیان خەویان لێ‌کەوتوە بەلاّم لە ئەنجامدا دەردەکەوێت کە ژنەکـەی کۆچی دوایێ کردوە . کە لە ئەنجامدا پیاوە دەدا بەسەری خۆیا و پەنجـەی پەشیمانی دەگەزێ و دەکەوێتە کوچە و کۆلاّنان و هاوار دەکا و دەڵێ :

بە خوا بە تەنها مرد ،
بەڵێ ئەنجامی سەرخۆشێ شێتییە !

پاشان دێتە سەر پەخشانێکی ئەدەبی کورت و لە ژێر ناوی «گۆران» کە هی «ایلاهویلر ویلکۆکس» ە و مامۆستا « حامد فرج » لە ئینگلیزییەوە وەری گێڕاوەتە سەر کوردی • کە باسی دڵداری دەکا و دەڵێت :

« من گۆڕاوم بە وێنەی جاران تۆم خۆش ناوێت ، بەڵام ئەمە نابێت ببێتە هۆی سەرسامیت ، چونکە لەم جیهانەدا هەمو شت ، ورد و درشت ، بچوك و گەورە لە گۆڕاندایە •• گوڵ ، درەخت ، باڵدار ، ئەستێرە • تەنانەت کیشوەرە گەورەکان و زەریا بێ پایانەکانیش • جگە لەمە ئاوات و ئامانجمان ، بیر و هۆشمان هەمو سەر دائەنەوێنن لە ئاستی یاسای گۆڕیندا •
بەڵێ ئێمە هەمو وەختێك گوڵ و وەنەوشە دەکەین هەتا گوڵانی تر دێن •
هەروەها لە سێ نوسینی بە نرخی مامۆستا «شاکر فتاح» ئەم پارچە پەخشانەمان هەڵبژارد کە ئەمەش دەقەکەیەتی :

# فرمێسکی کاکەمەم

**نمونەی کوردی پەتی**

« زین •••
باڵاگەردانی سەرت بم ••• تۆ کێی ؟ فریشتەی یان پەری ؟
ــ زیـن •••
جگەر سۆزەکەم ! تۆ لە چیت ؟ • لە تیشکی مانگ دروستکراوی یان لە کزەبای بەیان ! •••
راستە ! نێرگس لەبەر چاوی کاڵتا ،سێو لەبەر کوڵمی ئاڵتا بنەوشە لەبەر ئەگریجەی خاوتا ، خونچە لەبەر لێوی ئاڵتا ، بلور لەبەر گەردنی پاکتا ، سنەوبەر لەبەر کەمەرەتا عەرعەر لەبەر باڵاتا سەرشۆڕ و شەرمەزارن •
راستە ! سەرکردان بە لەشکریانەوە ، شازادان بە نۆکەریانەوە ،

سەرداران بە هۆز و دەست و پێوەندیانەوە ، چاوەڕوانی زەردەخەنەیەکتن •
راستە ! لە ناسکیدا گوڵ ، لە رۆشنایەتییا رۆژ ••• لە زۆرداریتا شاە
پەنجە لە پەنجەت نـادا •

راستە لەگەڵ ئەو هەمو حەز لێکردنە پاکوخاوێنەمـانا ، لەگەڵ ئـەو
هەمو دڵسۆزییەی تۆ و ئازاییەی منا •• لەگەڵ ئەو هەمو جوانییەی تۆ و
قارەمانییەی منا •• لەگەڵ ئەو هەمو میوانوازییەی براکانی تۆ و لاوچـاکی
منا •• لەگەڵ ئەو هەمو نزیك‌بونەوەی پێك گەیشتنەمانا دەستی بـەدکاری
کەوتەکار ، هەردوکمانی لەیەك کرد • منی بە گڵ دا و تۆشی بە ئاە و نـاڵە
سپـارد •

زیـن •••
راستە ! لەو دەمولێوە نوقوڵیەت ، لەو سنگە گەرم و نەرمە و مەمکە
خڕ و پڕەت ، لەو لەشە نەرم و نۆڵەت ، لەو قەدە باریکە و بالا بڵندەت ••
لەو دڵە ناسك و نازدارەت بێ بەش بمێنمەوە •
من بە خاك بسپێرێم و تۆش بە ئاخ و ئۆفەوە بتلێینەوە •
بمریـت ؟
زیـن •••
بالاگەردانی سەرت بم ، تۆ کێیت ؟! فریشتەی یان پەریت ؟
زیـن •••
جگەرسۆزەکەم تۆ لە چیت ؟ لە تیشکی مانگ دروست‌کراوی یان لـە
کزەبای بەیان ؟ ئایا لە پاڵ ئەم هەمـو رەنـج و کوێرەوەرییـەدا بەشمـان
دڵ‌سوتان‌بێ ، لەش‌سوتان‌بێ ، جگەرسوتان‌بێ » •

ش• ف•

دوایێ دێتە سەر نوسینێکی مێژویی بە ناوی «مامەیـارە» کە «م• ج»
نوسیویێتی ، لە پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە مامۆستا «محمود جەودەت»ە ،

که به ئاوێنەیەکی بێ وێنەی ڕوونی ئەو سەردەمە دادەنرێت . که ئەمیش دەقەکەیەتی :

« مامه یاره

له گردی گوڵان بمنێژن .. با لەوێ به تەنیابم ، چونکه نامەوێ گۆڕیشم نزیك گۆڕی ئەرشکەرەکانی کۆیەوەبێت » .

« مامه یاره »

له سەرگوزەستەی دوور و درێژ و له کاروانی نەسرەوتی پێشکەوتنی گەلدا ، لەناوجەرگەی بەربەرەکانێی سەخت و ملململانێ و زۆران بازێ له نێوان هێزی دادپەروەرێ و ڕووناکی و بەختیارێ و خێرخوایێدا بەرامبەر به هێزی ڕەش و چڵکنی ریسوایێ و ئابڕوچوونی کۆنەپەرستدا ، که له پیاو و پاڵەوانی مەزن و شاعیر و هونەرمەندی بەهرەوەر ، لەگەڵ کاوەی ئاسنگەری قارەمان که وەکوو مانگی چواردە ئاسمانی شینی تێکۆشانی پڕشانازێ ڕووناك کردۆتەوە و به پاچ و بێڵی خەباتیش ڕێڕەوی پڕتەنگ و چەڵەمە و کەند و کۆسپی ورەبەردانیان نەخت دەکرد ... که خۆیان کردە مۆمی سووتاو و به خوێنی ئاڵیان دڕیان به شەوەزەنگی تاریکێ ژیانەوە دەنا . زەنگ‌لێدەر و چەکوش وەشێن بوون بۆ ڕاپەڕێن و هێنانەدێ چەرخ و دەورێکی نوێ و ئاسۆیەکی روناکی پرشنگدار و بوونه چاو ساغ و پێشەنگی لێهاتوو بۆ پێچانەوە و ڕووخاندنی دەور و چەرخێکی نالەباری گۆڕکراو و بوونه پاڵەوانێکی نیشتیمانێ بۆ پاراستنی بار و دۆخی پڕ دەسەڵات و پێشکەوتوی نیشتیمانێ له بەردەم چنگ پێس و گورگ و داگیرکەری شوومدا .

ئالەم سووچ و گوزەرەوە دەڕوانینه مامه یارەی قارەمان که له دەرفەتێکی تایبەتێ مێژوودا ، چوه سەر لوتکەی بەرزی ئازایەتێ و نزاری شینی ئاسمانی نەمرییەوە ، که به دڵسۆزێ نواندنێکی زۆر و خۆڕاگرتنێکی بێ هاوتا ،

لاپەڕەیەکی زێڕینی لە مێژوی قارەمانێتی کوردا تۆمارکرد ، کە هەتا هەتایە لاوانی ئەمڕۆ و دوارۆژ مەشقی لەسەر دەکەن و بە عەشقی ئەو رێگایەوە توێشو هەڵدەگرن و رۆدەکەنە هێلانەی هەوڵ و کۆششی بە پێز و قوربانی دان و خۆبەختکردن لە پێناوی پارستنی مافەکانی گەل و بەختیاری نیشتماندا •

گردی مامەیارە کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی سولەیمانییەوە ، هەر چەند لە سەرەتادا بە گردی گۆلان ناوی دەرکردبو بەڵام لە هیچ لایەکەوە ناوی لە کولەکەی تەڕا نەدەهات و مشتی خۆڵ و بەردی بچوك بو لە چاو ئەو کۆمەڵە شاخە بەرزانەی ناوچەکانی سولەیمانی ، لە بەر پێی پیرەمەگرون و گۆیژە و گڵەزەردەدا ••• بە سەری روت و قوتەوە ملکەچ بو و کڕنوشی بۆ ئەو جوانی و شیرینییەی دەبرد کە سروشت بە کێو و کەژ و گردۆڵکە و دەشت و دەری کوردستانی بەخشیبو ، گردی گولان لە هەموی بێ بەش بو، هەرچەندە ناویشی گولان بو ، بەڵام لە ماڵی دنیای سروشتندا هەتیوێکی باوكمردە بو و هیچی نەبو کە خۆی پێ بڕازێنێتەوە و پێیەوە بنازێ و لە باخچەی جوانانـدا فیزی پێوە بکات •

مامە یارە «یار ئەحمەد» رۆڵەی بە جەرگی شارباژێڕ بو ، هەر چەندە «هۆمەر ئاغا»ی باپیری یەکێك بوە لە دوازدە سوارەی مەریوان بەڵام خۆی هەر ئەوەندە ناوی دەرکرد بو کە پیاوێکی سادەی خۆشەویست و ئەفسەرێکی تۆپچی لەشکری بەبە بو • ئەوەی بوە سەرچاوەی سەرتاپا گۆڕینی ژیان و دەنگدانەوەی ناونیشانی،ئەم شەڕە قارەمانێتییەیەتی کە لە سەر گردی گولان کردی ، کە بە وێنەی دوازدە سوارەی مەریوان ، بە تەنیا خۆی و تۆپە شڕەکەی ئازایانە لە بەردەم لەشکری رۆمدا وەستان و گاڵتەیان بە مردن دەکرد و لە پێناو پاراستنی خاکی نیشتیماندا گیانی خستبوە سەر لەپی دەستی • ئەم خۆبەختکردن و قارەمانێتییە بو کە ناوبانگی زڕاند و گەیاندییە

کەشکەشانی فەلەك و کردی بە پاڵەوانێکی میللیی گەورەی گردی گۆلان و هەمو کوردستـــان •

بە هۆی ئەم رووداوە مەزنەوە بو کە گردی گۆلان ناوی گۆڕا بە گردی مامە یارەی قارەمان و بەم رەنگە هەردو ناوەکە چونە مێژوی پڕشانازیی گەلی کوردەوە •

دەوڵەتی عوسمانلی لەو سەردەمەدا بڕیاری ئەوەی دا کە بە هەر نرخێك بێت دەبێ ناوی میرنشینی بابان لە لاپەڕەکانی مێژودا بسڕێتەوە و ئەم قەڵای بەرزی پڕ دەسەڵات و لانە و مەڵبەندی هیوا و خـــۆزگەی کورد بەســـەر دانیشتوانیدا تەخت کات و ئاغـــایەتی و زۆرداریی خـــۆی لەو ناوچـــەیەدا زیندوکاتەوە ، بۆیە لە ساڵی ١٨٤٧ دا فەرمان دەدرا لەشکر و جمبەخـــانەی زۆر بەسەرکردایەتی ( نەجیب پاشا ) کەوتە جوڵە و بۆ مەڵبەندی سولەیمانی راپێچ کرا بۆ تێکدانی فەرمانڕەوایی تەخت و تـــاجی بەبـــە • لەم لاشـــەوە بابانەکان کەوتنە خۆئامادەکردن و بانگی بەرگرییان راهێشت • لەشکر بـــە سەرکردایەتی ئەحمەد پاشای بەبە کەوتە رێکخستن و جم و جوڵ لەبەردەم ئەم هێرشە ناڕەوایەدا ، جێگە و مەڵبەندی بەرگریی توندکرد و بڕیاری دا کە لە پێناوی مانەوەی ئەم دەسەڵاتە و فەرمانڕەوایەتییەدا هەرچی لە توانادا بێت بیکات •• شەڕێك لەو شەڕانە لە گردی گۆلان روی دا کە « مامە یارە »ی قارەمان و ئازای تۆپچی لە ناو کورەی ئەم شەڕەدا بو بە پاڵەوانی مەیدانی هەتا هەتایی •• ئەو فەرمانەی کە پێی سپێردرابو کە پێویستە شەڕ بـــکات و جێگاکەی بەجێ نەهێڵێ لە سەری دەڕۆیشـــت و بەوپـــەڕی دڵنیـــاییەوە دەجەنگا و کۆڵی نەدەدا تا لە ئەنجامدا لەشـــکری رۆم هـــەرچوار دەوری گرت و بە دیل گرتیان ، بەڵام لە دڵی میللەتدا بو بـــە پاڵەوانێکی نیشتمانی ئەمڕۆ و دوارۆژیش و بە چاوی رێزەوە یادی ئەو قارەمانێتییەی دەکرێتەوە و گردی گۆلانیش بو بە گردی مامە یارە و شوێنەوارێکی پـــیرۆز •• گردی

مامه یاره هاته هاوشانی پیرەمەگرۆن و ناوی چوه مێژووەوه •

لە دوایشدا پیرە مێردی نەمر بۆ کۆچی دوایی گردی مامە یارەی هەڵبژارد و سەری هەتا هەتایی تێدا نایەوه •• بەم چەشنە جارێکی تر گردی مامە یارە بوو بە لانەی دوو پاڵەوانی نەمر •

دوایی دێتە سەر باسێکی تر کە گۆرانی نەمر لەم نامیلکەیەدا چوار هۆنراوە و پەخشانی تێدا هەیە ، کە ئەمە بەڵگەیەکی گەورە و بە نرخە کە بتوانین بڵێین گۆران بە گوڕ و گوژمێکی تایبەتی و بە دڵ و دەروونێکی تێگەیشتن و پڕ هەستەوە خۆی هاویشتە ناو جەرگەی ئەم کۆڕە پیرۆزەوە دڵی بە ئاوازی کوڵ هاتە گۆرانی بەتایبەتی لە هۆنراوەی «هەڵبەستی دەروون» کە دەڵێ :

**هەرچەند ئەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم**
**بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم**
**لێک دانەوەی دەروون ، قسەی زمانم**
**بۆچی وەها دوورن لە یەک نازانم**

واتا خولیا و سەودا سەرم لە مێشکمدا گێنگڵە دەدا ، ئەو خۆزگە و ئاواتە جوانەی کە پێی مەستم گیانی سمیوم ، دڵی پێکاوم ، ئەو ئامانجە پیرۆزەی کە دەماری گرتوم بە خوێنمدا دێت و دەچێت و هەرچەندە تەقەلا دەکەم و مێشکی خۆم دەگوشم بۆم ریز ناکرێ و بۆم رێک ناخرێ و رێگا و شوێنی دیاری کراوی خۆی نادۆزێتەوە و بۆم ناکەوێتە ناو قاوغ و ئەو چوارچێوەی کە خۆم دەمەوێت ، بۆیەکا شەیدا و وێڵی دوای هەوارگەیەکی سەوزم •• عەوداڵی کانیاوێکی سازگارم •

بەم وێنەش گۆرانی شاعیر و مرۆڤ بە وێنەی ئەو لاوە خوێن گەرمانە لە تاریکی شەوی ژینا پەلی دەکوتا و لە هەوڵ و کۆششا بوو بۆ زاڵبوون بەسەر ناکۆکییەکانی نێوان زمان و دڵ و دەروونندا ، گۆران ئەگەر لە یادگاری

لاواندا دۆ هۆنراوەی بۆبێت ، یەکێکیان هەوری پایز و ئەوەی تریان گەشتی هەورامان ، لە دیاریێ لاوانیشدا چوار هۆنراوە و پەخشانێکی کە هۆنراوەکانی : هەڵبەستی دەرۆن ، ئافرەت و جوانیێ ، گوڵی خوێناویێ ، بە سەرهاتی ئەستێرەیەك .

وا لە خوارەوەشدا ئەم پەخشانەیمان بڵاوکردەوە کە لە لاوانەوەی ئەوڕەحمان ئەفەندیێ ئامۆزای مامۆستا ئەحمد خواجە ئەفەندیێ دایناوە .

## لاوانەوە

بۆ برایەکی جوانەمەرگ ... «بۆ ئەوڕەحمان ئەفەندیێ رەحمەتیێ کوڕی سەعید ئەفەندیێ وەسمان ئاغا» .

ئەوا هەست گەڵاڕێزانی تەواوە : فرمێسکی پایزی بە سەرا باریێ ... هەشت کۆچی بەرەو گەرمیانی تەواو ، پۆلی قەل و قاز و دار و دەوەنیان رەشپۆشکرد ، ئەو ساڵانەی کۆن چەشنی وڵاتێك لێی جویێ بێتەوە ، یەك لە دۆی یەك بەرە بەرە لە چاو ونبۆن ، ئێستا لە دۆر دۆرەوە پەڵەیەك دۆکەڵی سپیێ لە ئاستی شوێنەکەیان بەرز دەبێتەوە ، لەگەڵ ئەوەشا من هێشتا بە رۆناکیێ و بە گەرمیێ و تازەییێ هەشت ساڵ لەمەوپێش ، هەوەڵ دیدارتم لە بیرە ، لاوێکی ئێسك سۆك و خوێن گەرم .. دڵتەڕ .. تەڕپۆش بە جۆتێك چاوی نێرگس و درشت کە هەر یەکە لە ئاسمانێك موغناتیس و زەردە خەنەیان تیا بۆ ، دەستی گوشیم ، برادەرەکان بە یەك دەم گوتیان :

« ـ ئەوڕەحمان :

لە پاشان منیشیان بە تۆ ناسیێ .

ناوەکەت ئەمەندە بە دەم برادەرەکانتا هاتبۆ ، بە لێوی خۆشەویستیێ ئەوەندە ماچ کرابۆ ، گرنجیێ و پرۆشەکانی سوابۆ ـ سفتبۆ .. لە خۆیەوە لە دەم ئەخزا چەشنی مێخەكبەندی سەر کەمەرە لەگەڵ هەمۆ لێوێك

ئەزڕایەوە • دەمی منیش چ زۆ هۆگری ئەم ئالتون رشـتنەبۆ ؟ چ زۆ بـە زنجیری ئارەزۆت راهاتم ؟ فێری براپەرستن بۆم ؟ •

لەو جارەوە کە هەمۆ سێ هەفتەیەك لە گەڵت رامبوارد ئەوڕەحمـانی هەوەڵ دیدار بەو تەوالێت و تەراش تازەیەوە بە گوڵە ئاڵەکەی بەر سنگیەوە بە زەردەخەنەی ئەوڕەحمانەکەی سەر لێوییەوە ئاشکراترین و رۆناکتریـن نەخشەکانی یادمـە •

ساڵی ١٩٢٨ چەن خۆشحاڵ بۆم کە هەردۆکمان پێکەوە بۆین بە ژێـر بەفرە زۆرەکەی پێنجوێنـەوە •

ئەو زستانە درێژەمان بە دیار ئاگرێکی خۆشەوە بە پێکەنین و گۆرانێ بردە سەر •

تۆ بە تەواوێ بۆ نەوجوانێ ژیان خوڵقابۆی •• بەیـانێ هەتـا ئێوارە وەکۆ هەنگی برسێ بە گۆرانێ وتن بە شوێن گوڵی رەنگاوڕەنگ و شیلەی شیرینا دەسوڕایەوە ، رۆشنایێ ژیانت ئەوەندە تیژ بۆ سەرچاوەی شـادێ هەنگوێنی هەرزەکانی لە تاریکترین پێچوپەنادا پەیدا بۆ • بە شـارەزایێ رێت ئەبردە سەری • منیش هەمیشە بە شوێنتەوە بۆم •

کەڵکەڵە و رەوشتی دنیای دڵدارێ و جوانیت گەرمایێ و جم و جۆڵی تافی نەوجوانیت ئەوەندە لە پێش چاوم شیرین بۆبۆ شـەو و رۆژ خەریکی مەشقی ئەوڕەحمانێ بـۆم •

لام وابۆ تۆ سەرمەشقی ژیان و نەوجوانیت ، راستەقینەکەش هەر وابۆ•
هەروا لە بیرمە نیوەشەوێکی ئەسـتێراوێ هـاوینی ١٩٢٩ بۆ ، لـە بەردەمی پێنجوێنی خەواڵۆدا زەبری زەمانە دەستی برایەتێ دۆ بێتاوانی لـە ملی یەکتری پچڕی •

تارمایێ تۆ بە دەم هەنیسکەوە لە ناو رەشایێ کۆلانەکانا بەرە بەرە ون بۆن ، منیش بەسەر بارگەیەکەوە بەرەو تەوێڵە شوێن کاروانی هەڵبـجە و ناڵەناڵی زەنگی تاریکێ کەوتم •

ئیتر لەو حەلەوە ناو بە ناوێکی چـەند رۆژی یـان چەنـد هەفتەیـێ یاخۆ لای ئەو پەڕی یەك دۆ مانگێ نەبێ تـۆ بە هەمۆ گوڕی لاوێتێ گەرێ جوانێ و قولپی برایەتییەوە لە من ونی •

قاقەزم زۆر کەم بۆ ناردوە بەڵام تاسـەی بە گەرم و یادی بە سـۆزم هەمیشە بە رێتەوە بوە •

لەگەڵ ئەوەشا حەقم بۆ زۆر دەربەستت نەبم ، چونکی ئەمزانی لـە ناو هـەچ کۆمەڵێکی ئاهنگای گۆرانێ ئەڵێیت •• بەسـەر هـەر شـەقامێکی ئێوارانەوە بێ ئەدرەوشێتەوە و •• لە هەچ پێچ و پەنایەکی نەوجوانیدا بێ هەنگوێنی دڵ ، خۆراکی گیان ئەمژێ •

بەڵام ئێستاکە هەچ قاقەزێك ئەکەیتەوە بە باسـی مردنی تـۆ بۆنی فرمێسکی لێ دێ •• ئـەی هو •• خۆڕاگرتن چـەن گرانە ؟ ئەوڕەحمان بمرێ ؟ گەرمەی جوانێ بژاکێ ؟ رۆشنایی ژیان لە نیوەی رێگادا بکوژێتەوە ؟ نەوجوانێ لە ژێـر پێـی مـەرگا بفلیقێتەوە ؟ هـەروا ئاگرم تێبەرئەبێ ، ئەوڕەحمان • چۆن ؟ ئێستا ئەم ئاسمانە شینە تۆی لە ژێرا نیت ؟ ئەم هەتاوە نەرمەی پایز لە سەر و تەوالێتی تۆ نادات ؟ ئەم دنیا گەورەیە بە دۆتا خوار و ژۆر بکرێ هەرگیز نادۆزرێتەوە ؟ ئەی لە کوێیت ؟ لە ژێر گڵا ؟ ••• ئاخ • »

« گۆران »

دوایی دێتە سەر تۆسینێك بە ناوی زەردەشت و دینی زەردەشتییەوە

« ر • ن »

دیاره لاوان زۆر مەبەستیان بوە مزە پەرۆش بۆن کە لاپەڕە ونبوەکانی مێژۆی کورد رۆن بکەنەوە و بن و بنچینەی بخەنە رۆ ، بۆیەکا بە نۆسینێکی تایبەتێ خەست و خۆڵ باسی زەردەشتیان کردوە ، کە لە نۆسینی مامۆستا « رەشید نجیب » ە ... ( ر ــ ن ) دەڵێت :

« ئەم چەند پەڕەیە ئەنجامی ئەرك و هەوڵ و تەقەلایەکی بە پێز بوە » چونکە لەو رۆژەدا دام و دەزگای ئیمپریالزم لە هاستە و هۆشــە و خەڕەك رستنابۆن ، تاکۆ وای بەرنە مێشکی خەڵکەوە کە کورد بێ رابۆردۆ بوە ، بێ مێژووە .. هەر جەردە و پیاو کوژ و رێگر بوە ، تاکۆ بگەنە ئەو ئەنجامە کە ئیتر پێویست بە جموجۆڵ و داواکردنی مافی رەوای ناکا .. لەبەر ئەمە هەوڵ و تەقەلای لاوان ئــەو رۆژە گەڕان بوە بــە شــوێن ســەرچاوەی مێژۆییدا ، چۆنە ناو کۆڕی عیلم و زانستییەوە و تاوتۆپێکردن بە کتێب ئەبێت بە چاوێکی گرنگ و بە نرخ و جێگای ریز و شانازێ دابنرێ .

لاوان لەم نۆسینەدا پیشانی دەدەن کە کوردی ئەمڕۆ بە رەگ و ریشە و بنج و بێخ دەچێتەوە سەر میدیا و زەردەشــت ، کە لە و لاتی میدیا لە پێش ١٤٠٠ ساڵ پێش زاینی هاتوەتە دنیاوە لە نەوەی کورد بوە . ئاوێستاش بە کوردێ کۆن نوسراوەتەوە . تەنانەت لای رۆژهەلاتناسەکان دەرکەوتووە کە زمانی ئاوێستا لەگەڵ کوردیدا زۆر نزیکە ، بەشی زۆری وشەی کوردێ بە لابردنی یــەك دۆ پیت ، وە یان گۆڕینی هەندێ پیتی هاودەنگ وەکو پ ( پە ) ف وە یا ( ب ) بە ئاسانێ دبرێتەوە سەر وشەی بنچینەیێ ئاوێستا .. ئاینی زەردەشتێ لــە کاتی بلاوبۆنەوەیدا دۆچاری زۆر تــەنگ و چەڵەمە و گیروگرفت بوە، بەلام لە دوایێدا هەر جێگای خۆی کردوەتەوە لە ناوچەیەکی گەورەدا بە پێی هەندێك لە نۆسراوە پەهلەوییەکان ئەم ئایینە لەو سەردەمەدا گەیشتوەتە رۆما ، یۆنان ، تورکستان ، هیندستان .

زەردەشت لەسەر بناغەی بیری چاك ، قسـەی چاك ، رەوشـتی چاك دامەزراوە و بە پێی یاسای ئەم ئایینە تەندروستی و پاك و خاوێنی و راستگۆیی لە ئاستی فەرمانرەوا و دایك و باوك و خزم و دراوسـێ و هاوولاتدا زۆر بایەخی دراوەتێ ، هـەر وەکو بایەخدان بـە کشـتوکاڵ ، ولاخراگرتن ، درەختناشتن ، دەربارەی خێزان ، ژن هێنان ، پەروەردەی منال ، بەرهەم هێنان زۆر بە رێزەوە باسی لێوە کراوە ، ئافرەتیش جێگا و شـوێنی بەرزی خۆی دراوەتێ ، لە دوایی‌دا ئاینی زەردەشت ئامۆژگاری زۆر بە نرخ و رێن و شوێنی راست و دروستی زۆر داناوە •

دیارە لاوانی ئەو رۆژە زۆر کەڵك و سوودیان لە ئامۆژگاری بە نرخ و بیری زانسـتی هەردوو مامۆسـتا « تۆفیق وەهبی و ئەمین زەکی بـەگ » وەرگرتوە ، چونکە بونی حالی هەردوکیان مەڵبەندێکی گەورەی جموجوڵ و هاتوچۆ و کۆبونـەوە و کۆڕێکی زانیـاری و مێژوویی و لێکدانـەوە و لێکۆڵینەوە بـوە •

پاشان دێتە سەر نوسینی پەخشانێك بە ناوی ئافرەت بۆ دەزگیرانەکەم، کە لە نوسینی « نەژاد »ە ، گەلێك هەوڵمان دا خاوەنەکەی بدۆزینەوە بەلام بێ سـوود بو •

ئەم نوسینە پەخشانێکی ئەدەبی و کۆمەلایەتی و ئامۆژگاری ساوەیە ، هەر چەندە شێوەی داڕشتنی کوردییەکەی بـەرزە ، باس لە پێویسـتی خۆی دراوەتێ ، لە دوایی‌دا ئاینی زەردەشت ئامۆژگاری زۆر بە نرخ و رێ و خوێندەوار بوەستێ ، چونکە تێگەیشتنی و خوێندەواری ، هەردولا مایەی بەختیاری و سەرکەوتن و بەرزی خێزانە ، بە پێچەوانەشەوە شیرازەی ژن و مێردایەتی دەپچڕێ و دوبەرەکی و لێك‌جیابونەوە و ئـاژاوە دەکەوێتە ناو ماڵەوە •• هەروەکو شارەزای هەردو لـە یەکتری و دامەزراندنی بناغەی

خێزان لەسەر کۆڵەکەی دڵداریێ و خۆشەویستیێ و بەرهەم هێنانی‌نەوەیەکی بەختیار و لەش ساغ و دوارۆژێکی رۆناك ٠٠ منالّ وێنەی بچوکی دایك و باوکە ئەگەر دایك و باوك نەزان بن هەر لە سەرەتاوە منالەکانی بە شتی بێ کەلك و هیچ و پوچ پەروەردە دەکرێ ، قەمچیێ دەستیان بۆ ترساندنی منداڵەکانیان گورگ و چەقەڵ و جنۆکە و دێو و درنج ٠٠ داو و دەرمانیان بۆ لەش ساغیێ منالەکان نوشتە و محمدی و کوژەکە شینە و مۆرووە کەرانەیە ، دوکتۆری بە بەناوبانگیان پورە عاصم و مەلا رەحیم ٠٠

پاشان دێتە سەر چیرۆکی کورتی دڵراکێشەری جوان و رازاوە و داڕێژراو بە شێوەی کوردیێ رەسەن و لە ژێر ناوی « شەوێکی گۆیژە » کە لە نوسینی مامۆستا ( حامد فەرەج )ە کە ئێستا خوێندەواری کورد دەیخوێنێتەوە تەزوی خۆشیێ بە دڵیا دێت و دەماری بەختیاریێ دەبزوێنێ ، باسی رابواردنی شەوێکی گۆیژەت بۆ دەکا ، دوایێ دێتە سەر پەخشانێك بە ناوی ( ژنێکی بەرز ) کە نمونەی کوردیێ پەتیێیە [ سکالای پیرە مێردێکی بەختیار]ەکە لە نوسینی مامۆستا ( شاکر فتاح )ە کە بە ؟؟؟ کوردیەکی پەتیێ و جوانی بێ هاوتاوە نوسیوێتەوە کە جێگای رێز و شانازیە بۆ رۆشنبیرانی کورد کە قوتابیەکی کوردی ئەو سەردەمە بەم چەشنە وشەی کوردیێ بهۆنێتەوە و بیکاتە مرواریەکی جوان و شیرین بۆ گەردنی بەرزی بەخشانی کوردیێ ٠ هەروەکو وتمان لەبەر ئەوەی لەم نامیلکەیەدا سێ نوسینی مامۆستا (شاکر) هەیە تەنیا یەکێکیمان بلاوکردەوە ، تا ببێتە سەر مەشق و پاڵپێوەنەر بۆ هەموو لاوێك و قوتابیەکی تازە پێ‌گەیشتوی ئەمڕۆ ٠٠ بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی رۆلەکانی رابوردو لە زیرەکی و دڵسۆزیێ و نیشتیمان پەروەریدا٠

لە پاشانا دێتە سەر وتارێك بە ناوی « باوە یادگار »

« ف٠ تاڵەبانیێ »

وا دیاره لەو ڕۆژەدا بەندوباوی ناڕەوا و بەیت و بالۆره چاوەڕاوێکی گەوره دژ بە عەشـــیرەتی کاکەیی بەرپا بۆبو کە نوسـەری بەڕێز « فاضل طاڵەبانی » دەخاتە قسەو رۆنکردنەوەی هەندێ راستی و دەڵێت : کاکەیی عەشیرەتێکی گەوره و رەسەنی کورد ، هەمو کوردێ پێویستە شانازییان پێوه بکا ، داوای بەرزی و سەرکەوتنیان بکا و باوه یادگاریش کە گەورەیانە مایەی شانازی و جێگای رێزه لای هەمو کوردێکی تێگەیشتوی دڵسۆز ، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان مامەم شـێخ رەزای تاڵەبانی قســەیەکی لە دەم دەرچوبێ بەرامبەریا ئەوه نەبێت بکرێ بــە بەڵگە و کوتەکی دەســتی ، هەندێ دژیان ، چونکە مامەم لەبەر تیغی زمانی کەس رزگاری نەبوه تەنانەت شێخ عەلی کاکەیی گەورەی خەڵکی زورەکەش بە گڕی ئاگرییەوه سوتاون ، باشترین بەڵگە بۆ بەرزی باوه یادگار هۆنراوەیەکی مەولەوی ، کە دەقەکەی نوسیوه و سەرتاپا بریتییە لە رێز و شانازی ، بەم چەشنە نوسەر قوڕ ئەدا بەدەم ئەوانەی کە دەیانوت لە باوەیادگاری رەسەنی عەشیرەتی کاکەیی کەم نەکاتەوه .

دوایی دێتە سەر هۆنراوەیەکی « شێخ سەلام » بە ناوی شـــیوەنی بە کوڵ « فرمێسك » هەروەها هۆنراوەیەکی بێکەس دێت کە بریتییە لە گۆرانی بەناوی « گۆرانی سپۆرت » کە لەسەر وەزنی « ئەی ئاغا و ئاغا » ــ بەم چەشنە نامیلکەکە دوایی دێت .